




# منداڵە

# خاوەن پێداویستە تایبەتیەکان

هۆکارو ... ڕێنماییکردن







# منداڵە خاوەن پێداویستە تایبەتیەکان

هۆکارو...ڕێنماییکردنیان


پرۆفیسۆر دکتۆر
شەوبۆ عبدالله طاهر
کۆلێژی پەروەردە / زانکۆی سەلاحەدین



بڵاوکردنەوەی
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
خـەتی بەرگ
نـەوزاد کۆیـی
نەخشەسازی ناوەوە
جمعە صدیق کاکە
بـــــەرگ
زەردەشت کاوانی
نۆرە و ساڵی چاپ
یەکەم 1438 ك ـ 2017
قەبارە
17 × 24 (160 لاپەڕە)
تـــیراژ
1500 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان- هەرێمی کوردستان- ژمارەی سپاردنی (785) ی ساڵی 2016ی پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice



# منداڵە خاوەن پێداویستە تایبەتیەکان

## هۆکارو......ڕێنماییکردنیان

پرۆفیسۆر دکتۆر
شەوبۆ عبدالله مە لا طاهر
کۆلیژی پەروەردە / زانکۆی سەلاحەدین



## پێشکەش بێت بە:

- ئەو دایک و باوکانەی خاوەنی منداڵی خاوەن پێداویستە تایبەتمەندیەکانن.
- مامۆستا و ئەو تاکە بەڕێزانە، کە ئەو منداڵانە ڕادەهێنن.
- ئەو قوتابیە خۆشەویستانە، کە لە بەشەکانی ڕێنمایی دەروونی و خاوەن پێداویستی تایبەت و زانستیە دەروونیەکانن .

# ناوەڕۆك

بەشی دووەم

بەشی سێیەم:

بەشی چوارەم:

**بەشی پێنجەم:**

بەشی حەوتەم:

## بەشی هەشتەم:

# پێشەکی

بایەخ پێدان بەمنداڵی خاوەن پێداویستە تایبەتمەندییەکان زۆر پێویستە، لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی وەکو مامۆستای بواری ڕێنمایی منداڵانی خاوەن پێداویستەکان بە هەنگاوێکی زانستی پەرتوکی خاوەن پێداویستیە تایبەتمەندییەکان....هۆکاری و.... ڕێنمایی بە زمانی کوردی بنوسم، لەسەر داواکردنی خوێندکارانی بەشی خاوەن پێداویستەکان، لەبەر نەبوونی هیچ سەرچاوەیەك لەو بابەتەوە بە زمانی کوردی، ویستم ئەو بابەتە بنچینەییانەی، کەپێویستیان پێ هەیە بەشێوەو بنەمایەکی زانستی و ستراتیژێکی جۆراوجۆر باس بکەم، هەتاکو ببێتە بەڵگەیەك لەژێر دەستیاندا .

هەروەها ئەم پەرتوکە، دەبێتە ڕێبەرێك بۆ مامۆستاو ڕێنمایی کاران و توێژەرانو مامۆستایانی پەیمانگە تایبەتەکانی ئەم جۆرە منداڵانە.

خێزانی ئەو منداڵانە، بەچڕی چاودێری منداڵەکانیان دەکەن و، فشارێکی زۆریان ئەکەوێتە سەر، لەبەر ئەوە پێویستیان بەم جۆرە پەرتوکە هەیە، کەچەند بابەتێکی گرنگ دەگرێتەخۆی، بۆ هاوکاریان وەکو ڕێبەریك بۆ زانینی هۆکار و چۆنیەتی مامەڵەکردنیان و تێگەیشتن و ڕێنماییان و چارەسەری کێشەکانیان، بۆ تێگەیشتن لە ڕەفتارو ڕەوشتی منداڵەکانیان، کە بتوانن بگونجێن لەگەڵ خودی خۆیان و دەوروبەرەکەیان.

لەم پەرتوکەدا، هەوڵم داوە چەند بابەتێکی گرنگ لەسەر ڕێنمایی و جۆرەکانی، کە زۆر پێویستە بۆ ڕێنمایی کاران و مامۆستایانی پەیمانگەکان و خێزانی منداڵانی خاوەن پێداویستەکان و خوێندکاران.

دوای ئەوە باسی منداڵی خاوەن پێداویستە تایبەتمەندییەکانمان کرد، کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵ کراوە، لە سەرەتای مێژووەوە، هەتاکو ئێستا، دەرمانخست، کە بەکێ دەڵێن منداڵی خاوەن پێداویستەکان، دواتر باسی جۆرەکانیمان کردووە، لەم پەرتوکەدا باسی چەند جۆرێکمان کردووە، وەك:

بەهرەداران... پەککەوتوان... بیرکۆلان... پەکەوتوی جولآنەوە و جەستەیی... نەبینایان... ئۆتیزم... ئەمەش دەبێتە بەشی یەکەم، هیوادارم، کە باسی جۆرەکانی تر لە پەرتوکێکی تردا بکەم.

ئومێدەوارم بەم پەرتوکە توانیبێتم، خانەیەکی بچووك لە خانەی پەرتوکخانەکانی بەشەدەروونزانیەکانی زانکۆکانی کوردستان پڕبکاتەوە .

نووسەر

2016/ 2 /15

# بەشی یەکەم

## پێشەکییەك لەسەر ڕێنمایی Counseling

ڕێنمایی چییە ؟

چۆن شێوازی ڕێنمایی دیاری ئەکرێت ؟

جۆرەکانی ڕێنمایی

یەکەم : ڕێنمایی تاکی

حاڵەتەکانی بەکارهێنانی ڕێنمایی تاکی

دووەم : ڕێنمایی بەکۆمەڵ

ئامانجەکانی ڕێنمایی بەکۆمەڵ

قەبارەی بەکۆمەڵی ڕێنمایی

شێوازەکان و ڕێگەکانی ڕێنمایی بەکۆمەڵی

1-یانەی ڕێنمایی.

2- شانۆی دەروونی.

3- وانەو وگفتو گۆ.

سێیەم : ڕێنمایی بە یاری کردن.

چوارەم : ڕێنمایی هەرزەکاران.

# بەشی یەکەم:

## پێشەکییەك لەسەر ڕێنمایی Counseling

مرۆڤ هەر لە سەرەتای مێژوودا... هەتاکو ئێستا.... زۆر پێویستی بە یارمەتی و ئامۆژگاری کەسانی تر بوە، بۆ چارەسەکردنی کێشەو گیروگرفتەکانی، بۆئەوەی بتوانێت بە ژیانێکی ئاسودە بژیت و، زاڵ ببێت بە سەر ئەو کێشە هەڵچوونە دەروونیانەوە، کەوا بەدەستیانەوە دەناڵێنێت، بۆ ڕێکخستنی ڕەوشت و ڕەفتاریەکانی و تێگەیشتن لەتواناو لێهاتوەکانیەوە، تاوەکو بتوانێت بەشێوەیەکی ئاشتی و ئاسودەیی، ناخۆشیەکانی ژیانی بباتە سەر، چونکە ئەم سەردەمەی، کە ئێمەی تێدا دەژین، پڕە لە خەم و خەمۆکیٚ و سەرقاڵی ژیان، هەر بۆیە بەسەردەمی دڵەڕاوکێ (Anxiety) دەناسرێت.

هەروەها ئەو گۆڕانکارییانەی، کەوا توشی تاك دەبێت لە ژیانیدا، وەکو: گیروگرفتە نائاساییەکان لە کاتە شلۆقەکاندا و.. گۆڕانکارییەکان، کە لە قۆناغی منداڵیەوە بۆ هەرزەکاری و... لە قۆناغی ناوەڕاستی تەمەنەوە... بۆ قۆناغی پیری و ئەو کێشانەی، کەوا تووشی دەبێت، هەتاکو کۆتایی تەمەن و، لە هەمان کاتدا، زۆر کێشەی دێتەڕێ، وەکو چوونەدەرەوەی لە ماڵەوە بۆ قوتابخانە و... لەتەواوکردنی قوتابخانەی بنەڕەتیەوە بۆ.. ناوەندی، هەتاکو ئەگاتە... زانکۆ و پەیمانگەکان و... لە تەواوکردنی خوێندن بۆ کارکردن لەناو کۆمەڵگاداو... لەژیانی تەنیاییەوە بۆ هاوسەرگیری و ئەرکی ماڵ و منداڵ،....(زهران 1985)

لەبەر ئەوەی قوتابیش تاکێکە لەم کۆمەڵگایەدا دەژی و توشی هەمان کێشە دەبێت، جگە لەوەش، کێشە تایبەتمەندییەکانی خۆی هەیە، وەکو کێشەی

گەشەکردن و ئەو کێشانەی، کە لە قوتابخانەدا توشی دەبێت و، ئەم هەموو قۆناغــە شلۆقاوی وململانێ و شڵەژانانە، کەوا تووشی دەبێت، دەبێتــە هۆکــاری نەخۆشــیە دەروونیەکان، بۆیە تاك پێویستی بە یەکێك هەیە، کەوا ڕێنمایی بکــات و دەســتی یارمەتی بۆ ڕابکیشێ و، لەو هەموو تــەنگ و چــەڵەمەو کێشــانە دەری بێنێــت و ڕزگاری بێت، ئەویش ڕێنمایی کارە.

## ڕێنمایی دەروونی چییە؟

ڕێنمایی دەروونی بریتیە لە: پەیوەندیەکی هونەری بزووتنەوەیی(Dynamic) لە نێوان دوو تاك یــان زیــاتر ئــەنجام ئــەدرێت، یــەکێکیان کــەپێ ئــەڵێن ڕێنماییکــار (المرشد- Counseler) خاوەنی پسپۆر و شــارەزایە هەڵدەســتێ بــە یارمەتیــدانی ئەوی تریان کە ڕێنمایی خوازە(المسترشد -Client) کە بەدەست چەند کێشەو گرفــت و نائارامییە کەوە ئەناڵێــنێ بۆ دۆزینەوەی خــوودی خــۆی وتوانــا و ڕاهاتنــەکانی و پێدانی هوشــیاری و شــارەزایی .بۆئــەوەی بتوانێــت لــە داهــاتوودا پشــت بــەخۆی ببەستێت وچارەسەری ئــەو کێشــانە بکــات کــە لــە داهــاتوا دێتــە ڕێــی .(مــەلا تییر2015 )

### شێواز و ڕێگەکانی ڕێنمایی دەروونی

ڕێگەکانی ڕێنمایی زۆرن و هەمــەجۆرن، هــەر ڕێگایــەك پشــت بــە بیردۆزێکــی تایبەت ئەبەستێت و، ناکرێت ڕێنماییکــار، تــەنها پشــت بــە بیردۆزێکــی تایبــەت ببەستێیت بۆ چارەسەرکردنی هەموو کێشەو گرفتەکانی دەروونی، بەڵکو بە گۆڕانی ڕێنماییخوازان و جۆری کێشەو گرفتەکانیان دەگۆڕێت، لەوانەیــە جۆرێــك ڕێنمــایی ئەشێت بۆ کەسێکی دیاری کراو، بەڵام ناشێت بۆ کەســێکی تــر، لێــرەدا سروشــتی ڕێنماییخواز و جۆری گرفتەکەی، شێوازی ڕێنمایی پێویست دیاری دەکەن .

زۆرجار ڕێنماییخواز حەز ئەکات بۆ ڕێنمایی و ڕاستگۆیی لەگەڵ ڕێنماییکــاردا، هەندێ جار جۆرێکی تر لە ڕێنماییخواز هەن، کــە ڕاســتگۆنین بــۆ ڕوون کردنــەوەی

گرفتەکانیان و کات بەسەربردن دەگرنەبەر لەگەڵ ڕێنماییکاردا، شتێکی ئاشکرایە لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکان و پێوەرەکان دەرکەوتوە، کە دوو کەس نیە هەمان هەڵسوکەوتی کەسایەتیان و هەڵچوونیان لە سەداسەد وەك یەك بێت، واتە ڕێنماییکار بۆ هەر ڕێنماییخوازێك و جۆری گرفتەکەی ڕێنمایی پێویست هەڵ ئەبژێرێ .

**چۆن شێوازی ڕێنمایی دیاری ئەکرێت ؟**

1ـ جۆری ئەو شێوازە کەڕێنماییکار ئەیگرێتەبەر دەبێت لەگەڵ هەڵسوکەوت و گرفتی ڕێنماییخواز گونجاو بێت .

2ـ دەبێت شێوازی گونجاو بێت بۆ کات وئەو توانایەی بە کاری ئەهێنێت .

3ـ ڕێنماییکار پێویستە لەسەر خۆ بێت بۆ ئەوەی زانیاری تەواو و پێویست لە گرفتەکەی بە دەست بهێنێت و، هەڵوێستی تایبەتی ڕێنماییخواز بزانێ .

4ـ ڕێنماییکار پێویستە پەیوەندی بەهێز لەگەڵ ڕێنماییخواز دروست بکات بۆ تێگەیشتنی لە هەڵسوکەوت و ئەو هۆکارانەی کە بوونەتە هۆی تێکچوونی باری ئاسایی ئەو پاڵپشتانەی لە دەورو بەریەوە ئەگۆڕێت بۆ پاڵپشتی خۆیەتی کە کە لە ناخی دەروونیەوە هەڵ ئەقولێت .

5ـ لەکاتی سەر نەکەوتنی یەکێك لەم ڕێگاو شێوازی ڕێنمایی کردنە، پێویستە ڕێنماییکار ڕێگایەك و شێوازێکی کاریگەر هەڵبژێرێت .

هەروەکو باسمان کرد شێواز و ڕێگەکانی ڕێنمایی زۆرن وەهەمە جۆرن بەپێ پابەندبوون بە بیردۆزەکانەوە، لێرەدا بە کورتی باسی هەندێکیان ئەکەین کە ڕێنماییکار بەکاریان ئەهێنێت بۆ کەسانی خاوەن پێداویستە تایبەتمەندیەکان، بۆ زانیاری زیاتر سەیری پەرتوکی نوسەر بکە (المشکلات الارشادیە ـ اسبابها ومقترحات حلها ) .

## یەكەم : ڕێنمایی تاكی Individual Counseling

بریتیە لە پرۆسەیەكی ستراتیژی بە ئامانجی یارمەتیدانی ڕێنماییخوازە بۆ ئەوەی لەو كێشەو گرفتارانە دەرباز ببێت كە توشی دەبێت، لێرەدا ڕێنماییكار ڕووبەڕوو دەبێت لەگەڵ یەك ڕێنماییخواز بەتەنیا بۆ چارەسەر كردنی گرفتەكانی و سەرلەنوێ ئەیگێڕێتەوە بۆ باری سەقامگیری .

**حاڵەتەكانی بەكارهێنانی ڕێنمایی تاكی :**

1ـ باری دەروونی وەك : دڵەڕاوكێ .... ترس ....شەرم كردن ....باوەڕبەخۆ نەبوون ... شەڕانگێزی ....

2- باری كۆمەڵایەتی : وەكو: جیابوونەوەی دایكو باوك (تەڵاق)....شەڕو ئاژاوەی ناوخێزان ...لادان و هەڵسوكەوتی پەسەند نەكراو ...ئاڵودەی جگەرە و مەی و مادە هۆشبەرەكان ...هتد .

3- گرفتی كەسایەتی : ئەم گرفتانە زۆر تایبەتن وەكو ....گرفتەكانی خۆشەویستی ....لادانی (سێكسی) .

4- گرفتی قوتابخانە : وەكو دواكەوتن لە خوێندن ....هەڵ هاتن لە ماڵ... و لە قوتابخانە، وازهێنان لە قوتابخانە، نەگونجاو لەگەڵ هاورێكانی لە قوتابخانە.

5- گرفتی دارایی: وەكو كەم دەرامەتی .....وبێ بەشبوون لە پێویستیەكانی ئاسایی خۆی .

6- گرفتی تەندروستی : ئەو نەخۆشیانە ئەگرێتەوە كە ڕێنمایی خواز ناتوانێ باسی بكات شەرم ئەكات وەكو ....نەخۆشی ئایدز ....نەخۆشیەكانی سیكسی... یان جۆری لە نەخۆشیەكانی زگماكی .

7- ئەو بارانە ئەگرێتەوە كەناكرێت لە ڕێنمایی بەكۆمەڵ باسی بكات .

## دووەم : ڕێنمایی بەکۆمەڵ Group counseling

ڕێنمایی بەکۆمەڵ بریتیە لە ڕێنمایی کردنی کۆمەڵێك لە ڕێنمایی خوازان، کە کێشەیەکی هاوشێوە و لەیەکچوویان هەیە، ڕێنمایکار کە لە چەند دانیشتنێکی ڕێنماییکردندا کۆیان ئەکاتەوە، لە کەشێکی ئارام و دوور لە شڵەژان و ترس دروست ئەکات بۆیان، ئەندامی کۆمەڵگە لەگەڵ یەکتری کارئەکەن بەئامانجی گەیشتن بە چارەسەری کێشەکانیان و گۆڕینەوەی بیرۆکە و ڕاو بۆچوون لە نیوانیاندا.

**ئامانجەکانی ڕێنمایی بەکۆمەڵ**

1-زاڵبوون بە سەر هەست کردنی ڕێنمایی خواز بەکەمی وتەنیایی .

2-فێرکردنی کۆمەڵە کە متمانەیان بە خۆیان و بەکەسانی تریش ببێت .

3- پەرەپێدانی و ڕێزگرتنی لە کەسانی ترو ڕێزگرتن لە بیرو بۆ چوون و هەستەکانیان.

4-پارێزگارکردنی لە پێوەرە ڕەوشتییەکانی کۆمەڵ .

5-هەوڵ ئەدات کە تاکەکانی کۆمەڵگە لێهاتوویە کۆمەڵایەتیەکان وەربگرن .

7- پابەند بوون بە ڕەوشتەکانی کۆمەڵ و هاوکاریکردنیان و پارێزگاریکردن لە نهێنیەکانیان .

8- دروستکردنی هاوڕێیەتی و یارمەتیدانی کەسانی تر .

9- فێرکردنی کۆمەڵەکە بە شێوازەکانی قسە و گوزارشکردن لە دەروونی خۆیان بە ئازادیەکی تەواو .

**قەبارەی کۆمەڵی ڕێنمایی :**

دیاریکردنی قەبارەی کۆمەڵی ڕێنمایی ڕۆڵێکی گرینگی هەیە لەسەرکەوتنی پرۆسەی ڕێنمایدا، وە گونجاوترین ژمارە بۆ کۆمەڵی ڕێنمایی (5-10) کەسە چونکە هەرچەندە ژمارەکە گونجاوتربێت ئەوا پرۆسەکە لەژێر کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی

ڕێنماییکاردا دەمێنێتەوە، ئەگەر هاتوو ژمارەی کۆمەڵەکە زیاتر بوو ئەوا لە ژێر کۆنترۆڵی ڕێنمایکار دەردەچێت.

هەڵبژاردنی تاکەکانی کۆمەڵەکە بە پێی تەمەن، ڕەگەز، جۆری کێشەکە یان چالاکیەکە دەبێت، باشترە دانیشتنێك یان دوو دانیشتن بکرێت لە هەفتەیەکدا وە ماوەی دانیشتنەکە لە (45) خولەك تێپەر نەبێت بۆئەوەی تاکەکان توشی بێزاری و بێتاقەتی نەبن.

**شێوازەکان و ڕێگەکانی ڕێنمایی بەکۆمەڵ:**

**یەکەم :یانەی ڕێنمایی:**

یەکەم کەس ئەم شێوازەی بەکار هێنا پزیشك (سلافۆن 1943) بوو کە چارەسەری نەخۆشیە ئەقلیەکانی ئەکرد، ئەم ڕێگایە گوزارشت دەکات لە کۆمەڵێك چالاکی بۆ ئارامبوونەوەی دەروونی، ئەمەش کۆمەڵێك چالاکی وەرزشی و هونەری ئەگریتەوە، هۆڵی تایبەت دیاری ئەکرێ بۆ هەموو چالاکیەك وهەر کۆمەڵێك چالاکیەکی گونجاو بۆ خۆی هەڵ ئەبژێرێت، کە بگونجێت لەگەڵ هیواو ئارەزوەکانی، ودوای کۆتاییهاتنی چالاکیەکان، کۆمەڵەکان ئەحەسێنەوە و هەڵچوونەکانیان خاڵی ئەبنەوە و هەموویان لە هۆڵێکی تایبەتدا کۆ ئەکرێنەوە بۆ حەسانەوە و خواردن، لەکاتی ئەو حەسانەوەیەدا دەست دەکەن بە قسە گۆڕینەوە و گفتوگۆ کردن لەنێوانیاندا، بەوەش ڕەفتاری شەڕانگێزی و شەرم کردن کەم دەبێتەوە لەلایان و کارلێکی کۆمەڵایەتی ڕوو ئەدات و، باوەر بە خۆبوون زیاد دەبێت.

**2- نواندنی شانۆیی دەروونی (سایکودراما Psychodrama):**

پزیشکی نەخوشیە ئەقلیەکان (مۆرینۆ Moren 1927) یەکەم کەس بووە کە ئەم ڕێگایەی بەکارهێناو، شانۆیەکی چارەسەریی دانا بۆ پێشکەش کردنی شانۆیی دەروونی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، ئەم شێوازە پشت دەبەستێت بە بیرۆکەی چارەسەرکردنی دەروونی و کۆمەڵایەتی ، ئەم ڕێگایە دەرفەت دەدات بە

تــاك تــاوەکو هەڵچــوونەکانی خــۆی دەربخــات وە ئــازادی پــێ دەبەخشــێت لــە ڕەفتارەکانیو، بە ئازادی گوزارشت بکات لە هەموو ئەو شــتە شــاراوانەی کــە لــە ناخیــدا هەیــە. هــەروەها دەربــارەی ململانــێ و پێداویســتە چــەپێنراوەکانی، کــە یارمەتیدەرن بۆ بەدەست هێنانی گونجان. (زهران:1980)

1. بابەتی چیرۆك: لەلایەن ڕێنمــایی خوازانــەوە دادەنرێــت ، لەهەنــدێ حاڵــەت ڕێنماییکاریش بەژداردەبێت لەگەڵیان.
2. ئەکتەرەکان: ئەو ڕێنمایی خوازانەن کە هەڵدەستن بە ڕۆڵگێڕانی شانۆییەکە.
3. دەرهێنان: یەکێك لە ڕێنمایی خــوازان پێــی هەڵدەســتێت، یــان بــەهاوکاری هەموویان دەبێت.
4. هەڵبژاردنی ڕۆڵەکان:پێویســتە بــە پێــی پاڵنــەرو حــەزی هــەموو ئەنــدامی کۆمەڵەکە بێت وە دەبێت گوزارشت لە بیرو بۆچوونەکانی بکات.
5. بینەرەکان: ئەمانە بریتین لە ئەندامانی ڕێنمایی کــاران وە ئەنــدامی گروپــی ڕێنمایی خوازان.

**سودەکانی نواندنی دەروونی شانۆیی :**

1. لایەنە گرینگەکانی سایکۆدراما کێشەکانی ڕێنمایی خوازان دەردەخات.
2. زانینی ململانێ و پاڵنەر و ئارەزوو و هەستەکانی ڕێنمایی خواز.
3. ناسینی لایەنە گرینگەکانی کەسایەتی ڕێنمایی خواز.
4. هانــدانی دەربــڕینی هەڵچــوونی دەدات بــۆ ڕزگــاربوون لــە شــڵەژان و هەڵچونەکانی.
5. توانای ڕێنمایی خواز زیاد دەکات لە گوزارشت کردن لە دەروونی خۆی.
6. ڕێنمایی خوازان ڕادەهێنێت بۆ ڕووبــەڕوو بونــەوەی ئــەو هەڵوێستانەی کــە واقعین و دەترسن ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێستانە ببنەوە.
7. بەدیهێنانی پرۆسەی کارلێکی کۆمەڵایەتی لە نێوان ڕێنمایی خوازان.

**سێیەم : وانەو گفتوگۆکردن:**

ئەم شێوازە پشت دەبەستێت بە پێشکەش کردنی وانەو و گفتوگۆ بۆ گوزارشت کردن لە ئاراستەی رێنمایی خوازان، و کەشێکی خێزانی زاڵ دەبێت بەسەریاندا، وخاوەنی ئەم رێگیەش زانا (لیفین Liwin 1941) ە ، لەم رێگایەدا پێویستە ئەندامانی کۆمەڵی رێنمایی خواز لەرووی ئەقڵییەوە لەیەك بچن و لە هەمان ئاستی ئەقڵیدا بن وە کێشە پەروەردەیی و کۆمەڵایەتییەکانیان لە یەك بچێت ، دەبێت گفتوگۆ لە بارەی هەندێك بیرۆکەو ئاراستەو بیرو باوەڕی خورافی (ئەفسانەی) و نالۆژیکی لەلای هەندێك لە رێنمایی خوازان بکرێت ، وە لێژنەی گفتوگۆ لە رێنمایی کاران و پزیشکان و توێژەرانی کۆمەڵایەتی و مامۆستایانی ئاینی پێك دێت .

**چۆنیەتی هەڵبژاردن و پێکهێنانی کۆمەڵەی رێنمایی بەکۆمەڵ:**

رێنماییکاری دەروونی هەڵدەستێت بە هەڵبژاردنی کۆمەڵێك چالاکی بۆ رێنمایی بەکۆمەڵ لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە:-

1. پێویستە تەمەنی تاکەکانی کۆمەڵەکە لەیەکتر نزیك بێت .
2. باشتر وایە ئەندامانی کۆمەڵەکە لەیەك رەگەز بن.
3. نەبوونی نێوەندێکی نزیك لە نێوان ئەندامەکاندا، ئەمەش بۆ نەبوونی ئەگەری نهێنی لەنێوانیان.
4. باشترە ئەم حاڵەتانە دوور بخرێنەوە(شەرانگێزەکان، ئەوانەی کە توشی حاڵەتی هێدمە دەبن، ئەوانەی کە پەککەوتون) .

**حاڵەتەکانی بەکارهێنانی رێنمایی بەکۆمەڵ:**

1. لەگەڵ ئەو رێنمایی کارانەی کە حاڵەتی رێنمایی تاکی پەسەند ناکەن.
2. لە لەکاتی بوونی کێشەی گشتی.
3. بۆ رێککردنەوەی رەفتار و ئاراستەی نەرێنی لەلای رێنمایی خواز .

4. بۆ چارەسەرکردنی کێشەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان و، خۆنەگونجاندن لەگەڵ کۆمەڵگەدا.
5. لەکاتێکدا کە ڕێنمایی خواز هۆشی لەسەر خودی خۆی هەبێت.
6. کەمی ڕێنماییکاران و بەفیڕۆنەدانی کات و توانا و لایەنی ئابووری.
7. لە کاتێکدا کێشەکان زۆر لە یەکچووبن.

## سێیەم :ڕێنمایی کردن بە یاری (گەمە کردن) counseling Play

یاری بریتیە لە کۆمەڵێك چالاکی وجووڵەی جەستەیی و دەروونی، پاڵ ئەنێ بە منداڵەوە بۆ یاری کردن، هەستی ئەویش خواستێکی بۆماوەییە، و ماوەی مانەوەی لای منداڵەکە و جیاوازەبە جیاوازی ماوەی منداڵیەوە .

یاری پەیڕەو ئەکرێت بە زمانی ڕەمزی منداڵ، بۆ دەربڕین لە خودی خۆی یان خوودلەکاتی مامەڵە کردن لە گەڵ یاری دەکرێ، منداڵ هەستی خۆی بەدیار ئەخات سەبارەت بە دەروونی خۆی وکەسانی گرنگ لە ژیانیدا.

زانایانی گەشەی دەروونی جەخت دەکەنەوە کە یاری (پیشەی منداڵە) و، کاریگەری ئەکات لە گەشەی کەسایەتی منداڵ، هەروەها بوارێکە بۆ دەرخستنی ودەربڕین لە بۆچوون وهەستی، بەڵام کۆمەڵەی زانستی دەروونی وای ئەبینن کە یاری چارەسەرێکە بۆ هەڵوێستی ژیانی ڕۆژانەی منداڵ.

( زهران 1980) وای ئەبینێ کە یاری بریتیە لە چالاکی قەرەبووکردنەوەی بەرگری، ئەو منداڵەی کە کەیف و شادی وخۆشەویستی لە ناوماڵدا دەست ئەدات ئەوا لە ڕێگەی تێکەلاو بوون لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی خۆشی ئەوێن وگرنگی پێ ئەدەن لە دەرەوەی ماڵەوە بە دەستی ئەهێنێت وقەرەبووی ئەکاتەوە .

هەروەها ڕێی نیشان دان بە یاری کە ئامرازێکە لە بواری ڕێپیشاندانی منداڵ کە پشتی پێوە ئەبەستێ بەو بنەما دەروونیانە کە ڕێك ئەکەون لەگەڵ قۆناغەکانی

گەشەکردن کە منداڵ پێدا تێ دەپەڕێ و لەگەڵیدا ئەگونجێت و بەکاریان ئەهێنێت، دەبێتە دەسنیشان کردن و چارەسەر کردنی دڵە ڕاوکێ و کێشەکانی .

**سوودەکانی ڕێنمایی کردن بە یاری بۆ منداڵان :**

یاری پەیڕەو ئەکرێت کە زمانی ڕەمزی منداڵە هەست و هەڵچوونەکانی دەرئەبڕی لەکاتی یاریدکردندا زیاتر لەوەی بە ووشە دەری ئەبڕێ، لیردا ڕێنمایکار یارمەتی منداڵ ئەدات کەچەند سوودێکی لە یاری وەربگرێ وەکو :

1. بەستنی پەیوەندیەکی ڕێنمایی لەگەڵ منداڵدا
2. یارمەتی منداڵ ئەدات بۆ نەهێشتنی هەڵچونەکانی .
3. یارمەتی منداڵ ئەدات بۆ دوربین وپەیوەندی بەهێز .
4. لە ڕێگەی یارییەوە منداڵ پێویستیە دەروونیەکانی تێر دەکات.

## شێوازەکانی یاری کردن لە ڕێنماییدا

ڕێنماییکار بۆ چارەسەری کێشە دەروونیەکانی منداڵ دوو شێوازی یاری بەکار ئەهێنێت :

**یەکەم : یاری ئازاد یان ئاراستە نەکراو یاخود بێ سنور نەکراو :**

ڕێنمایی کار لەم شێوازی یاریکردنەدا ئازادی تەواو ئەدات بە منداڵ بۆ ئەوەی کە ڕێگەی بداتێ بە ئازادی یاری بکات، هەموو جۆرەکانی یاری کردن بەئارەزوی خۆی هەڵبژێریت، وئەم شێوازی یاریە یارمەتی منداڵ ئەدات لە کاتی یاری کردندا هەرچی لە ناخیا بێت دەری ببڕێت وەکو هەست و ئارەزووەکانی، و ڕێنمایی کاریش جار بە جار بەشداری ئەکات بەپێ حەزی منداڵەکە، و چاودێری منداڵەکە ئەکات کاتی یاری کردنی خۆی بەتەنیا، بۆ ئەوەی لە باری دەروونی تێ بگات، پاشان لەگەڵیدا بەرە بەرە بەشداری ئەکات تاوەکو یارمەتی ورون کردنەوەی پێ بدات لە چۆنیەتی یاری کردن .

**دووەم : یارى ئاراستەکرا و یان سنور دیاریکراو :**

ئەم یاریە ئاراستە کراو دارێژراوە بۆ منداڵان، بەشێوەیەك کە ڕێنماییکار شوێن وجۆری ئەو بابەتەیاریانە هەلبژێرێت کە لەگەڵ تەمەن وشارازایی منداڵ بگونجێت بەشێوەیەك کە لەگەڵ ڕاستی نزیك بێت، هەروەها ئازادی بە منداڵ نادات .

لەم شێوازی یاریەدا منداڵ هەلدەستێ بە بەدەستهێنانی کرداری چارەسەری گرنك کە ئەویش دەرخستنی حەزو ئارەزوو شتە شەڕانگێزی و ترس ودڵە ڕاوکێ لە ناخی خۆیدا.

هەروەها یاری کردن بە ئاو لە یاریە گرنگەکانە لای منداڵ چونکە لێرەدا پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەل منداڵانی تر ئەبەستێ، وکێبرکێ باش و ڕەوا وبەشداری کردنی کاریگەرلە لای گەشەئەکات و ئەبیتە هۆی تواناى وزەی دەروونی نوێ هەر وەکو هەست کردن بە ئارامی و ئازادی لای زیاد دەبێت لە کاتی یاری کردن بەو یاریانەی کە بۆی دانراوە . (منسی:2004)

**چوارەم : ڕێنمایی هەرزەکاران:-**

هەرزەکاری قۆناغێکە کە تاك بەرەو پێگەیشتن دەڕوات، ئەو قۆناغێکە لە نێوان کۆتایی منداڵی و سەرەتای پێگەیشتنە، کە ئەمەش کردارێکی بایۆلۆجیە ئەندامییە لەسەرەتا و کۆتاییەکەشی کۆمەڵایەتییە لەم قۆناغەدا گۆڕانکاری جەستەیی و ئەقلی و هەڵچونی و کۆمەڵایەتی ڕوو دەدات، واتە کەسایەتییەکی نوێی بۆ دروست دەبێت، هەندێك زانای دەروونزانی وەسفی دەکەن بەوەی کە هەرزەکاری ماوەیەکی هەستیار و ململانێ پەستانی کۆمەڵایەتی و دڵەڕاوکێیە و هەرزەکاری وشەیەکی لاتینیە (Adolessence) .

**کێشەی هەرزەکاران :-**

قۆناغی هەرزەکاری قورسترین قۆناغی ژیانە و قۆناغی نێوان منداڵی و پێگەیشتن کە کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەسەردادێت کە پێشتر باسمان کردوە گرینگترین

کێشەی هەرزەکاران ئەوەیە کە باوك کۆمەڵێك شتی بەسەردا دەسەپێنێت کە لەگەڵ ئارەزووی دا ناگونجێت، وهەندێ لە هەرزەکاران لـەم قۆناغـەدا دەسـت دەکـەن بـە جگەرەکێشان و بەکارهێنانی مادەهۆشبەرەکان و توندوتیژی و لادانی کۆمەلایـەتی و توشـی کێشـەی سێکسـیش دەبـن و، توانایـان لـە خوێنـدن کـەم دەبێتـەوە و، لەشێوازی ژیان و خوێندنیشیان سەرکەوتوو نابن .

**هۆکارەکانی کێشەی هەرزەکاران:-**

1. خێرایـی گۆڕانکـاری جەسـتەیی :- گواسـتنەوە لـە قۆنـاغی منـداڵی بـۆ هـەرزەکاری وە خێرایـی گەشـەیی جەسـتەیی شـوێنەواری سـلبی لـێ دەکەوێتەوە: وەکو تەمبەڵی و ناهاوسـەنگی هەڵچوونەکان، هـەروەها لـەم قۆناغەدا ئەندامەکانی زاوزێ پێدەگات، هەرزەکار هەوڵ ئەدات ئامانجەکانی جێبـەجێ بکـات و ئارەزوەکـانی تێـر بکـات، لـە ئەنجامـدانی ئـەم حـەزو ئارەزوانەی پێ تێر ناکرێت بۆیە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشە.
2. پاڵەپەسـتۆی کۆمەلایـەتی:- هـەرزەکار توشـی کۆمـەڵێك ئاسـتەنگی و بەربەستی دەبێتەوە کە لەلایان باوانەوە لەسەر هەرزەکار فەرز دەکرێـت کـە بێگومان هەرزەکار ئەمەی پێ خۆش نیە.
3. پێویستی هەرزەکار بۆ ڕزگارکردنی خۆی:- کە بە پشت بەسـتن بـە دایـك و باوك لەرووی ئابووری و کۆمەلایەتیەوە هەرزەکار هەوڵدەدات بـیرو بۆچـونی تایبەتی خۆی هەبێت و خۆهەڵقوتاردنانەی خێزان لە کاروبـاری برادەرەکـانی ڕەت دەکاتەوە.
4. هەرزەکار وا خۆی دەبینێ کە نەمنداڵـە و نەگەورەشـە ئەمـەش ململانێـی دەروونی بۆ دروست دەکات لەنێوان ئەو کەسانەی کە لەخۆی بچوکترن و ئەو کەسانەی کە لە خۆی گەورە ترن، بەم جۆرە هەرزەکار نازانێت کێیـە ولـە چ کۆمەڵێەکە .

5. هەرزەکار پاڵنەری هەڵچوون و حەماسەتی زۆرە و، ئـارەزوو و دەمـارگیری و زیـادەڕۆیی زۆر دەکـات و، زوو تـوڕە دەبێـت و دەوروژێـت و کاردانـەوەی دەبێت.

**خزمەتگوزاریەکانی ڕێنمایی هەرزەکاران:-**

خزمەتگوزاری پەروەردەیی جنسی یـان سێکسـی:- پێویسـتە هـەرزەکار پـێش (بلوغ- پێگەیشتن) هەموو جۆرە گۆڕانکارییەك بزانێت کە لە جەستەیدا ڕوودەدات ، خێزان و قوتابخانە بەرپرسن لەوەی زانیاری یان سێکسـی بدەنـە هـەرزەکار لـە زۆر حاڵەتدا خێزان بەم ئەرکەی خۆی هەڵنەستاوە، بۆیە پێویسـتە لایـەنی پـەروەردەیی بەم ئەرکەی خۆی هەڵبستێ.

**1-خزمەتگوزاری خێزانی :-**

ئەم خزمەتگوزارییانە پێشکەش بە هـەرزەکاران دەکرێـت بـۆ ئـەوەی ژیـانێکی خۆش و ئارام بەسەربەرن لەگەل تاکەکانی خێزانەکەیاندا، وەپێویستە دایـك وبـاوك ڕێنمایی بکرێن بۆ ئەوەی لە پێداویستەکانی هەرزەکاران تێبگەن.

**2- خزمەتگوزاری پەروەردەیی :-**

یارمەتی هەرزەکار دەدرێت بۆ ئەوەی ڕزگـاری بێـت لـە تـرس و دڵـەراوکێ و، هەروەها جۆرێکی خوێندنی گونجاو هەڵبژێرێت بۆ خۆی کە لەگەل ئاست و توانایـدا بگونجێت وە بۆ ئەوەی کەش و هەوای پۆلی خوێندن گونجاو بێت .

**3-.خزمەتگوزاری پیشەیی:-**

ئەم خزمەتگوزاریە پێشکەش بـە هـەرزەکاران دەکرێـت چـونکە پەیوەنـدی بـە داهاتووی هەرزەکارەوە هەیە بۆ ئەوەی هەرزەکار بتوانێـت ژیـانی خـۆی مسـۆگەر بکات بۆ ئەمەش پێویستە پلان و ڕێنمایی بۆ هەرزەکار دابنرێت.

### 4-خزمەتگوزاری ڕێنمایی چارەسەر کردن :-

یارمەتی هەرزەکار ئـەدرێت بـۆ ئـەوەی ڕزگـاری بێـت لـەو کێشـە وشـڵەژانە دەروونیانــەی کــە بــەرۆکی گرتــوون وەك: (دڵــەراوکێ، دەمــارگیری، کەلــەڕەقی، توندوتیژی)، دەبێت ئەم ڕێنماییانە پێشکەش بە هەرزەکار بکرێت کـە لـە کـەش و هەوایەکی گونجاو و ئارام بن.

### 5-خزمەتگوزاری و ڕێنمایی کاتە بەتاڵەکان :-

لەم کاتــە بەتاڵانــەدا پێویســتە گرینگــی بــدرێت بــە ئارەزووەکــانی هــەرزەکار لەلایەنی کۆمەڵایەتی و هونەری و وەرزشی وە لایەنی هونەری وەکــو خوێندنــەوەی هەڵبەست و هەروەها سیمینارو ورك شۆوپ کـە سـود بـەخش بـن بـۆ هـەرزەکارو ڕۆشنبیرکردنیان.

# بەشی دووەم

## بوارەکانی ڕێنمایی دەروونی

یەکەم : بواری ڕێنمایی پەروەردەی

ئامانجەکانی ڕێنمایی پەروەردەیی دەروونی

دووەم : بواری ڕێنمایی پیشەیی

کێشەکانی ڕێنمایی پیشەیی

سێەم : ڕێنمایی خێزانی

خزمەتگوزارییەکانی ڕێنمایی خێزانی

1- خزمەتگوزاری پەروەردەیی خێزانی

2- خزمەتگوزاری دەروونی

3- خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکان

## بەشی دووەم:

## بوارەکانی ڕێنمایی دەروونی

ئەم بوارانە جۆراوجۆرن بەگوێرەی بیردۆزەکان بە جۆرێك کە هەموو دیاردەکانی ژیانی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، لێدا باسی هەندیکیان ئەکەین :

### یەکەم : بواری ڕێنمایی پەروەردەیی :

- ئەم ڕێنماییە هاوتایە لەگەڵ کرداری فێرکردنی ڕێنمایی پاڵنەری قوتابیان دەوروژێنێت بۆ خوێندن وەئامادەیان ئەکات لە لایەنی زانیاری و پیشەیی و کۆمەڵایەتیەوە و، یارمەتییان ئەدات بۆ ڕزگاربوون لە دڵەراوکێ و ترس ، خزمەتگوزاری، ڕێنمایی ئێستا زۆر پێویستە بۆ پاراستنی قوتابیان تاوەکو توشی کێشە نەبن هەروەها بەرچاویان ڕۆشن ئەکاتەوە بۆ ئەوەی بریاری دروست بدەن سەبارەت بە خوێندن و ژیانیان.

بواری ڕێنمایی پەروەردەیی بریتیە لە قوتابخانە کە گرینگی دەدات بە لایەنی زانستی و زانیاری، بێگومان قوتابخانەش مەڵبەندێکی ڕووناکیە لە کۆمەڵگا و ڕۆڵی خۆی بەتەواوی بگرێت پێویستە ڕێنمایی دەروونی جێ بە جێ بکات.

#### ئامانجەکانی ڕێنمایی پەروەردەیی دەروونی :-

( زهران1980) وای بۆ ئەچێت کە ئامانجی سەرەکی ڕێنمایی پەروەردەیی بریتیە لە بەدەست هێنانی سەرکەوتنی پەروەردەیی ئەمەش لە ڕێگای زانینی ڕەفتاری قوتابیان و یارمەتی دانیان بۆ هەڵبژاردنی جۆرێکی گونجاوی خوێندن و سەرکەوتن لە خوێندن بەم شێوەیەی خوارەوە:-

1. یارمەتیدانی قوتابیان بۆ هەڵبژاردنی جۆری خوێندن و پسپۆری كە لە گەڵ توانا و ئارەزووەكانیان بگونجێت .
2. یارمەتی قوتابیانی بەهرەمەندان ئەدات بۆ ئەوەی تواناكانیان زیاتر گەشە بكات وە سود لە تواناكانیان وەربگیرێت .
3. گرینگیدان بە حاڵەتەكانی دواكەوتن لە خوێندن واتا ئەوانەی كە لە خوێندن دابراون یان ئەوانەی كە لەكاتی خوێندندا گرفتیان هەیە یان كۆسپیان دێتە پێش .
4. پێشكەش كردنی خزمەتگوزاری بۆ قوتابیان كە توشی شڵەژانی دەروونی و كۆمەڵایەتی هاتوون.
5. یارمەتیدانی ئەو قوتابیانەی كە كێشەی ڕەفتارییان هەیە، وەكو قۆپیەكردن و دزی و درۆ و هەڵاتن لە قوتابخانە.
6. پێشكەشكردنی خزمەتگوزاری و ڕێنمایی خۆپاراستن و گەشەپێدانی قوتابیان بۆ ئەوەی ئاراستەكانیان بۆ لایەنێكی باش بگۆڕن و، كاتەكانیان ڕێك بخەن و پشت بە خۆیان ببەستن.
7. یارمەتیدانی قوتابیان بۆ گەیشتن بە بەجێ هێنانی تەندروستی دەروونی و بەجێ هێنانی خود.

## دووەم : بواری ڕێنمایی پیشەیی

كردارێكی یارمەتیدانی ڕێنمایی بۆ ئەوەی پیشەیەكی گونجاو بدۆزنەوە و لەسەری بەردەوام بن، ئەم جۆرە ڕێنماییە بە پلەی یەكەم یارمەتی تاكەكان دەدات بۆ هەڵبژاردنی پیشە وكار بۆ داهاتوویان، گرینگترین ئامانجی ڕێنمایی دەروونی پیشەیی بریتیە لە (دانانی كەسی شیاو لە شوێنی شیاو) .

**کێشەکانی ڕێنمایی پیشەیی:**

1. هەڵبژاردنی پیشەیەکی گونجاو بۆ تاك کە لەگەڵ توانایی و ئارەزووەکانیدا بگونجێت .
2. کێشەی پەیوەندی کردن بە کارەکە، ئەمەش پێویستی بە ئامادەکردنی قوتابیان لە بواری دەروونی و پیشەیی هەیە، هەوڵ بدەن کە شارەزایان زیاد بکەن لە پیشەکە .
3. کێشەی دامەزراندن بە شێوەیەکی هەرەمەکی بەبێ گوێدانە توانستی پسپۆری تاکەکان.
4. خراپی گونجانی پیشەیی، واتا نارازیبوونی تاك لە کارەکەی یان هەندێ جار کەسەکە کە کار ئەکات کێشەی لەگەڵ هاوپیشەکانی دەبێت ئەمەش وا ئەکات کە تاکەکان کارەکەیان بەجێ بهێڵن .

**سێیەم : ڕێنمایی خێزانی:**

خێزان بەهێزترین کۆمەڵە کە کاردەکاتە سەر کەسایەتی تاك و ڕەفتارەکانی و، خێزان ڕۆڵێکی کارای هەیە لە بنیات نانی کەسایەتی منداڵ و گواستنەوەی دابو نەریت و کارامەییەکان و ئاراستەکانی کۆمەڵگا بۆی، کەواتە خێزان مەرجی یەکەمە لە گەشە پێدانی کۆمەڵایەتی و پەروەردەکردنی بە جۆرێك کە پێداویستەکانی دابین دەکات، ڕەوشتی منداڵەکەش دەوەستێتە سەر خێزانەکەی ، دایك و باوك لەتوانایان دا هەیە کە ئەم خزمەت گوزاریانەی سەرەوە پێشکەش بە منداڵەکانیان بکەن بە هەماهەنگی لەگەڵ ڕێنمایی کار ، بەم شێوەیە بۆمان بەدیار دەکەوێت کە ڕێنمایی خێزانی کە شێوازێکی پیشەیی ڕێکخراوە کە جۆرەکانی پەیوەندی کارلێکی کۆمەڵایەتی بەجێ دەهێنێت لە نێوان ئەندامەکانی خێزان و کۆمەڵگا.

**خزمەتگوزارییەکانی ڕێنمایی خێزانی :-**

**1- خزمەتگوزاری پەروەردەیی خێزانی:-**

خێزان ئەرکەکانی بریتیە لە ئامادەکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان لە ڕووی دەروونی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی، بۆ ئەوەی ئەو منداڵانە ڕۆڵی خۆیان ببینن بە شێوەیەکی دروست و کاریگەر، هەر خێزانە کە خۆشەویستی و نەرم و نیانی و دڵنەوایی دەبەخشێت بە منداڵەکانیان و پێداویستەکانیان پر دەکاتەوە.

**2- خزمەتگوزاری دەروونی:-**

ئەم خزمەتگوزارییانە ئاراستەکردنە بەرەو ئەو کێشە دەروونییانە کە تاکەکانی خێزان پێوە دەناڵێنن، ڕێنماییکار هەڵدەستێ بە پتەو کردنی پەیوەندیە خێزانیەکان و لابردنی کۆسپ و تەگەرەکان و هەڵدەستێ بە نزیککردنەوەی بیروبۆچوونەکان.

**3- خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتیەکان :-**

ئەمەش مەبەستی یارمەتیدانی و هاوکاری کردنە لە نێوان تاکەکانی خێزان بۆ ئەوەی پەیوەندی خێزانی بێنێتەوە ، وە هەروەها کەسایەتی تاکەکانی خێزان کامل بێت لە ڕووی کۆمەڵایەتی وهەست و سۆز و جەستەیی و ئەقلی وە ڕێنمایی کاری کۆمەڵایەتی لەگەڵ دایك و باوك هەڵدەستن بە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکانی ناو خێزان لەڕێگای دانانی پلانێکی لەسەرخۆ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان .

## بەشی سێیەم

## منداڵی خاوەن پێداویستی تایبەت

ئەومنداڵانە کێن کە پێیان ئەڵێن خاوەن پێداویستی تایبەت.

پێ ناسەی منداڵی خاوەن پێداویستی تایبەت .

جۆرەکانی منداڵانی خاوەن پێداویستی تایبەت

پوختەیەکی مێژوی دەربارەی بایەخ دان بەپەرەپێدانی و چاودێری کردنی خاوەن پێداویستی تایبەت

قۆناغەکانی مێژوی پەرەپێدانی خاوەن پێداویستی تایبەت.

1- لەچەرخی کونەوە هەتاکوساڵی(500) پێش ز.

2-لەچەرخی( 500) سالی بێش ز. هەتاکو سەدەی پێنجەمی ز.

3-لەچەرخی راپەرینەوە(سەدەی پێنجەمی تاکوسەرەتای نۆزدەهەمینی ز.

4-لەسەردەی نۆزدەهەمین دا هەتاکو ئێستا.

ئامانجەکانی پەروەدەی خاوەن پێداویستی تایبەتیەکان .

پرۆسەی رێنمایی خاوەن پێداویستی تایبەتیەکان .

تیپی رێنمایی دەروونی

# بەشی سێیەم

## ئەومنداڵانە کێن کە پێیان ئەڵێن خاوەن پێداویستی تایبەت :

منــدالی خــاوەن پێداویســتی تایبــەت Children with Special Needs وشــەی پێداویســتی تایبــەت " الاحتیاجــات الخاصــە " Special Needs مانایئەوەئەگرێتەوە کـە جیاوازێـك و لادانێکـی دیـاری کراوەیـان هەیـە لەگـەڵ منــداڵانی ئاسـاییدا ، Normal Child، لـەباری ئـەقلی وزانسـتی وجەسـتەیی و کۆمەڵایەتی وهەستی وزمانەوانیەوە کە وای لێ ئەکات پێویستی زۆری هەبێت بـە خزمەت گوزاری کەسانی ترەوە.

ئەومنداڵانە چەند جۆریك ئەگرێتە خۆی وەکـو ....بـەهرەدار و سـەرکەوتوەکان ... یـان ئەوانـەی کـەم وکوریـان هەیـە لـە ئەندامـەکانی لەشـدا (پەککـەوتوی جەستەیی) ....یان لە هەستەکانیاندا وەکو (نـەبینان ..و نەبیسـتان) وئـەم جـورە پەککەوتوانە نەخۆش نین بەڵکو دواکەوتون لە گەشەکردنی یەکێك لە ئەندامــەکانی جەستەیاندا .وبەشێوەیەکی گشتی کار لە گەشەکردنی لایەناکانی پەروەردەو فێربون وراهینانیان ئەکات.

هەروەها منــداڵانی ئـۆتیزم ... ومنداڵــە دواکـەوتوەکان لـە تواناکـانی ژیـری (بیرکـۆلان) ...و شـڵەژانی لایـەنی دەروونـی وڕەوشـتیدا، .هـەموو ئەومنداڵانـە پێویستیان بە ڕێنمایی و مامەڵەو پەروەردەی تایبەت هەیە بەپێ جۆرەکانیانەوە.

### پێناسەی منداڵانی خاوەن پێداویستی تایبەت :

بـریتین لـەو منداڵانـەی کـەوا پێداویسـتی تایبـەتی خۆیانیـان هەیـە جیـاوازە لەپێداویستەکانی کەسانی ئاسایی بە تایبەت لە بواری فێربون وپەروەردەو پرۆگـرام و خزمەت گوزاری وئامێرەوە، و هەریەکێك لەو منداڵانە پێداویستی تایبەتی خۆی

هەیە چونکە جۆرا و جۆرن وەکو:

بلیمەت و بەهرەداران ...پەککەوتوەکان ..بیرکۆڵەکان ..ئۆتیزمەکان کە لەمەو پێش باسمان کرد. بەهرەدارو بلیمەتەکان : بریتین لەو کەسانەی کە ڕێژەی زیرەکیان لە کەوانەی زەنگۆڵیدا لەسەر (120) نمرەیە،وە پێویستیان بە .. ڕێنمایی.. و مامەڵەو.... پەروەردە و... پرۆگرامی تایبەت هەیە کە جیاوازن لە گەڵ کەسانی ئاساییدا .

بیرکۆڵەکان : بریتین لەو کەسانەی کە ڕێژەی زیرەکیان لە کەوانەی زەنگۆڵیدا لەژێر ناوەندی (70) نمرە کەمترە لادانێکی هەست پێکراوە لەئاستی: (عەقلی...جەستەیی ... هەڵچوونی ...وکۆمەڵایەتی ) بەجۆرێك كەوا پێوستیان بە پرۆگرامی پەروەردەی تایبەت وەزانیاری وفێربوون وراهینان هەیە .

## جۆرەکانی منداڵانی خاوەن پێداویستە تایبەتەکان

یەکەم-بەهرەداران و سەرکەوتوان ـ الموهوبون والمتفوقون Gifted& Talented

**دووەم - پەککەوتوەکان : ئەم جۆرانەی خوارەوە ئەگرێتەوە :**

1. نەبینان الاعاقة البصرية Impairment Visual
2. نابیستان الاعاقة السمعية Hearing Impairment
3. جوڵە و جەستەیی الاعاقة الحركية والجسدية
4. بیرکۆڵان(پەککەوتوی-عەقلی) (المتخلفون) Mental Impairment
5. پەککەوتنی کۆمەڵایەتی الاعاقة الاجتماعية Impairment of Social

بریتین لەو تاکانە کەتوانای مامەڵکردنی ئاساییان لەگەڵ ژینگەکەیان نیە، ولایان داوە لە پێوانەو ڕۆشەنبیری کومەڵگاکەیان،وەکو:

| | | |
|---|---|---|
| أ- سواڵکەرەکان | المتسول | Cadgser |
| ب- لاسارەکان | الجانحون | Delinquents |
| ج- تاوانبارەکان | المجرمون | Criminals |
| **سێیەم: - ئۆتیزم** | **التوحد** | **Autism** |

چوارەم: - شڵەژانی پرجوولەیی

مندالّ النشا ط المفرط Hyperkinetis

پێنجەم –ئاستەنگی فێربوون پەروەردەیی

صعوبات التعلم slow learners

شەشەم: شڵەژانی هەستی

الاضطرابات الانفعالية Emotional disturbances

## پێ ناسەی ڕێنمایی خاوەن پێداویستی تایبەت

بریتیە لە پەیوەندیەکی هونەری وبزووتنەوەیی بۆ یارمەتی دانی منداڵی خاوەن (بلیمەت و بەهرەدار .. یان پەککەوتو ...یان بیرکۆل ئەوجۆرەکانی تریـۆ زاڵبـوون بەسەرتوانا یان ئەو کەموو کوڕیانەی کە تووشی بووە، وهەوڵدان بۆچارەسـەرکردنی هەمو ئەو کێشانەی کە دێتەبەر ڕێی هەتاکو توانای گونجانێ لەگەڵ خـودی خـۆی وخێزانکەیدا ببێت، وئەمەش بە یارمەتی ڕێنماییکار دەبێـت کەهـەوڵ ئـەدات بـۆ ڕاهێنان و پەرەپێدانی توانا ولێهاتوەکانی.

### پوختەیەکی مێژوویی دەربارەی بایەخدان بەپەرەپێدانی وچاودێریکردنی خاوەن پێداویستە تایبەتەکان

بـە دریـژایی مێـژووی جیـاوازی هـەبووە لەسـەر مامەڵـەکردن لەگـەڵ خـاوەن پێداویستی تایبەتەکان جگە لـە بەهرەمەنـدەکان، هەمیشـە واسـەیر ئـەکران کـە بارێکی زۆر گران وقورسن لەسـەر بـواری ئـابوری وکومەڵایەتیـەوە، هەرلەکۆنـەوە بڕوایان وابو کە ئەمانە دەرئەنجامی کاری پیسو چەپەڵی شەیتانن یان جنۆکە چوەتە ناوگیانیەوە

قۆناغەکانی مێژووی پەرەپێدان بە خاوەن پێداویستە تایبەتمەندیەکان:

1- لەچەرخی کۆنەوە هەتاکو ساڵی(500) پێش ز .

لەسەردەمەمێژوە کۆنەکاندا :

لەو زەمانەدا زۆر بەچاوێکی ڕەشـبینیەوە سـەیری ئـەو منداڵانـە ئـەکرا وایـان ئەزانی کە ئەمانەدەرئەنجامی ڕوحی شەیتانن (خێویکـە) وکـاری خـراپ و سـحر و جادوون، یان توڕەبوونی خواکەیانەوەیە ڕاسـتەوخۆ هەڵدەسـتان بـە کوشـتنی ئـەو منداڵانەی کەوا پەککەوتوی جەستەییان هەیـە لـە دوای لـە دایـك بوونیـان، ئـەو منداڵانەش کەلە دواتر پەکیان ئەکەوت لە کۆمەڵگا دور ئەخرانەوە و لە ناو شوێنی چۆڵدا بەجێیان ئەهێشتن هەتاکو مردن . (ملحم:2009)

**2- لە چەرخی ( 500) سالی بێش ز. هەتاکو سەر دەمی پێنجەمینی ز.**

لەو سەردەمانەدا کۆمەڵگا هەندێ بایەخی بە منداڵانی پەککەوتو دا بـەڵام بـە شێوەیەکی زۆر سنووردار، وئەمەش بەهۆی هەڵکـەوتنی چـەند فەیلەسـوفیکەوە بـو وەکو (هیپۆقراتHippocrate ) هەر لەو باریەوە ئەڵێت :

**سوێندی هیپۆکرات** : لە بیری ئەکەم کە پزیشکی زانست و هونـەرە : لەوانەیە ـ گەرم و گوڕی ـ ونەرمی ـ وتێگەیشتن ـ سـودیان زۆر تـر بێت لە چەقۆی نەشتەگەری یان داو دەرمانی دەرمان ساز .

**قسم هيبو قراط** : سـوف أتـذكر أن الطـب علـم وفـن - وأن الـدفء واللين والتفهم يمكن أن يكونوا أكثر فائـدة مـن مشـرط الجراح اودواء الصيدلي .

Hippocratic Oath : I will remember that there is art to medicine as well as science, and that warmth, sympathy, and understanding may outweigh the .surgeon's knife or the chemist's drug

بەڵام لە هەمان کاتدا کوشتنی منـداڵی پەککـەوتو هـەر بـەردەوام بـو وفڕیـان ئەدایە ناو ڕوبارو چەمەکاندا هەتاکو ئەخنکان یان لەسەر شاخ وکۆە دایان ئەنان تا ئەمردن)، هەر لەو سـەردەمەدا یاسـایش ڕێ ئـەدا بـە هـەر بـاوکێ کەوامنـداڵی پەککەوتوی هەبێ بیکوژێت، چونکە لایان وابوو کە ئەو منداڵانـە هـیچ کـەڵکیان نیـە وە بـارێکی زۆرقـورس و گـرانن بەسەرشـانیانەوە، و لـە هـەمان کاتیشـا

کۆمــەڵگایش بــە جــاوێکی دور لــە مرۆڤایــەتی ســەیری تاکــە بەساڵاچــوەکان و پەککەوتوەکانیان ئەکرد،بۆ نمونە حکومــداری ڕۆمــا( کومــودوس Commodus) کەوا ئەو کەسانەی کە پەگگەوتو وکەم ئەندامن بەکاری ئەهێنان بۆ نیشانە گــرتن لەکاتی ڕاهێنان و مەشق کردن بە تیر، هەروەها هەنــدێ لــە پیــاوە دەوڵەمەنــدە ڕۆمانیەکان لە کاتی کۆبونەوەیان بۆ گاڵتە وگــەپ هەلدەســتان بــە هێنــانی چــەند کەسێك لە بیرکۆلەکان بۆ گاڵتە وپێ کەنین ورابــواردن ســوکایەتی پــێ کردنیــان . (نصرالله :2002)

بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ لە پزیشکە یونانیەکان هەنگاوی باشــیان دانــا بــۆ چارە سەرکردنی پەککەوتوەکان وایان بەباش ئەزانی کەپێویستیان بــە ژینگەیــەکی هێمن و ئارامی هەیە دور لە قەڵبالغی ونائاساییەوە، و لە هەمان کاتدا هەنــدێکتر لەو پزیشکانە وایان بەباش ئەزانی کە جارەسەریان ئەوەیە کەوا...بەبرســیەتی .... وسەرتاشین ....ولێدان ....کوشتن....بێت .

**3- لەچەرخی ڕاپەڕینەوە(سەردەمی پێنجەمین تاکوسەرەتای نۆزدەهەمینی ز.**

لەم چەرخەدا پزیشك و فەیلەسوفەکان هەڵسان بە جیاکردنەوەی کاری پزیشــکی لە ئاینەوە کە بەلای چەند فەیلەسوفێکەوە بــو وەك(جــان لــوك-J. Lock ) و (ژان ژاك ڕۆسۆ-J.J. Rousseau)، ) وایکرد کە پزیشکەکان بگــەڕێن بــە شــێوەیەکی زانستی بۆ هۆکاری توش بوون بە پەککەوتن، و بۆیان دەرکەوت کە شڵە ژانێــك لــە شلەکانی لە ناو جەستەی ئەو تاکانەوە دروست بــووە وبــوە بــەهۆی پەککــەوتنیان، لێردا دەستیان کرد بە هەوڵ وتێکۆشان بۆ چارەسەرکردنیان . (الوزانە:2005)

لە دەرئەنجامی ئەو بانگەوازیەدا ساڵی( 1837) زانا سجوین هەڵسا بە دروســت کردنی یەکەم قوتابخانە بۆ فێرکردنی منداڵە بیرکۆڵــەکان لــە فەرەنســا، و لەســاڵی (1912) لە ئیتالیا زانا (ماریا منتسوری (Maria Montessori) بــڕوای وابــو کــە ژینگە کاریگەرێکی زۆری هەیە بۆگەشەکردنی منداڵ، ودەستی کرد بە دابین کردنی پرۆگرامێکی تایبەت بۆ ڕێگە وانەوتنەوەو فێرکردنــی منداڵــە بیرکۆڵــەکان، و ئــەم پرۆگرامە بریتیە لە فێرکردنی ئەو منداڵانە بە شێوەیەکی زۆر گونجــاو وهاوڕێــژەیی

بەپێی توانا ئەقلیکانیانەوە، بەمەرجێك فێرکردن ..هەنگاو بە.. هەنگاو بێت لە شتی ئاسانەکانەوە بۆ شتە قورس و گرانەکان، ئەو ڕێگای وانەوتنەوە هەتاکو ئێستاش بەکار دێت .

### 4- لەسەردەمی نۆزدەهەمین دا هەتاکو ئێستا :

لەو سەردەمەدا گرنگیەکی زۆر درا بە ڕاهێنان وپەروەردە کردنی تایبەت بۆ هەموو ئەوانەی خاوەن پێداویستی تایبەتن، وئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ دەرچوونی چەند یاسایەکی میری کەمافی ئەو گروپانەی تیادا ئەپارێزێت و کاریگەرێکی گەورەی هەبو بۆدروست بوونی چەند ڕێکخراو سەندیکایێك .

هەروەها لە سەرەتای ساڵی( 1960) ز . لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا دەست کرا بە گرنگ پێدان بە پرۆگرامی پەروەردەی خاوەن پێداویستەکان،کەهەوڵ درا بۆ دروستکردنی چەند پەیانگا وسەنتەر وناوەندێك کە زیاتر لە چوار ملیون منداڵی لە خۆی گرتبو، هەر لەو کاتەوە هەتاکو ئێستا لە هەموو ولاتانی جیهان گرنگ پێدان بەو منداڵە پەککەوتوانە بەر دەوامە بەلام زۆربەی ئەو ناوەند و سەنتەرانە گرنگی ئەدەن بە دابین کردنی پێداویستە گرنگەکانیان و توانا و بەهرەکانیان لە پشتگۆی خستوە .

**ئامانجەکانی پەروەدەی تایبەت :**

1- ناسینی ئەو منداڵە پەککەوتوانە بە ئامرازەکانی پێوان و جیاکردنەوەی هەموو جۆرەکانیان

2- دانانی ڕێگەکانی وانە وتنەوە بۆ هەموو جۆرەکانی خاوەن پێداویستە تایبەتەکان وجێبەجێی کردنی ئامانجی پرۆگرامی پەروەردە .

3-دانانی پرۆگرامی فێرکردن و تەکنەلۆژیایی تایبەت بۆ هەموو جۆرەکانی پەروەدەی تایبەت وەکو نەبینان وبیرکۆلان ونابیستان ...هتد

4- دانانی پرۆگرامی خۆ پاراستنی منداڵان لە توشبوون بە پەککەوتن، و کار کردن بۆ کەم کردنەوەی ڕوداوی پەککەوتن لە ڕێگەی پرۆگرامی تایبەتەوە

### پرۆسەی ڕێنمایی خاوەن پێداویستە تایبەتەکان

پرۆسەی خاوەن پێداویستە تایبەتەکان پێك دێت لەم خاڵانەی خوارەوە :-

1. گەڕاندن بەشوێنیاندا بەزووترین کات تاوەکو بتوانێت بە زووی چارەسەر بکرێن .
2. چاودێری پزیشکی ودیاری کردن و چارەسەرکردنیان بە پێی جۆرەکانیان
3. دۆزینەوەی ئەو منداڵانە کە بەهرەدار وبەتوانان
4. ڕێنمایی بەروەردە وفێرکردنیان بەپێی جۆرەکانیان
5. ڕێنمایی کردنیان بۆئەوەی بتوانن بەئاسای لەژیانیاندا بگونجێن .
6. یارمەتیدانیان بۆ ڕاهاتنیان لەگەڵ ئەو جۆرە پەککەوتنەی پێوەدەناڵێن و بەرِنگاربونەوەی ئەو کێشانەی کە توشی بوون .

### تیپی ڕێنمایی دەروونی

تیپی ڕێنمایی دەروونی پێکدێت لە چەند کەسانی پسپۆر هەموویان پێکەوە ئیش دەکەن ویارمەتیداری یەکترن بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی ڕێنمایی دەروونی هەتاکو بتوانن جاو دێری ئەومنداڵانە وخیزانەکانیان بکەن، و ئەو تیپە لەم تاکانەی خوارەوە پێك دێت :

1 - ڕێنمایکاری دەروونی — المرشد النفسي — Counseler

2- پزیشکی پسپۆری منداڵ — اختصاصي طب الاطفال — Pediatrician

4- توێژەری کۆمەڵایەتی — الاختصاصی الاجتماعی — Social worker

5- پەرەستار — الممرضة — Nurses

6- پسپۆری چارەسەری سروشتی — اختصاصي العلاج الطبيعي — Therapy Physical

7ـ پسپۆری چارەسەری ئیش — اختصاصی العلاج الم — Occupational Therapist

8- مامۆستای خاوەن پێداویستە تایبەتمەندەکان — Special Educator

# بەشی چوارەم

## بەهرە داران وسەرکەوتوەکان

## Gifted and Talented

- بەیاخ دانی مێژوی پەرەپێدانی وچاودێریکردنی بەهرەداران سەرکەوەتوەکان
- ئەو کەسانە کێن کە پێیان دەڵێن بەهرەدار وسەرکەوەتوەکان؟
- خەسڵەتەکانی بەهرەداران وسەرکەوتوان
- پۆلینکردنی بەهرەدار وسەرکەوتوەکان
- کاریگەری بۆ ماوەیی و ژینگەیی لەسەر بەهرەمەندی
- جۆرەکانی بەهرەداران
- دابەشکردنی ڕێژەی زیرەکی بەپێی پێوانەی بینیە-ووکسلر
- تایبەتمەندی بەهرەداران و بەهرەدارە سەرکەوتوەکان
  1. تایبەتمەندیی جەستەییەکان
  2. تایبەتمەندییە ئەقلیەیەکان
  3. تایبەتمەندی هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی
  4. تایبەتمەندی زانیاری وفێربون

جۆرەکانی بەرنامەی پەروەردەیی بۆ قوتابیانی بەهرەداران

کێشە وگیروگرفتی بەهرەدار وسەرکەوتوەکان

ئامانجەکانی ڕینمایی بەهرەدار و سەرکەوتووەکان

ڕۆڵی ڕێنماییکار بۆ منداڵانی بەهرەدار

# بەشی چوارەم:

## بەهرە دارو وسەرکەوتووەکان Gifted and Talented

### بایەخ پێدانی مێژوی پەرەپێدانی وچاودێریکردنی بەهرەدارو سەرکەوتووەکان:

توێــژەرە و ڕۆشــەنبیرەکان جیــاوازی دەبیــنن لەهەوڵــدانێکی بــەردەوام و بیرکردنەوەیەکی پێشکەوتو وتوانای بەرز لە هەوڵدان بۆ پەرەپێدانی وچاودێریکردنی بەهرەدارە سەرکەوتوەکان، بۆنموونە هەرلەســەرەتاوە کــە مــرۆڤ لەئەشــکەوتەکاندا ژیاوە ئەگەر هاتووئەو مرۆڤە توانایەکی ئەقڵی بەرزی هەبوایە وکەسێکی بــەهرەدار بوایە ئەوائەیتوانی لەڕێگای ڕاوکردنەوە ببێتە ڕاوچییەکی باش، لــەوولاتی چــین لــە پێنج هــەزار ســاڵ لەمــەو پــێش بەرنامــەیکی تایبــەتیان هــەبوو بــۆ هەڵبــژاردنی فەرمانبەری زیــرەك و بــەتوانا ولێهاتوەکــان، ئیمپراتــۆر خــۆی گرینگــی بــەوجۆرە کەسانە داوە وخوێندنی بی بەرامبەری بۆدابین کردوون ، وپێیان وابوو ئەوانــە گــران بەهان پێویســتە چــاودێری بکــرێن، ولــەپاش دوو هــەزار ســاڵ (ئیفلاتــون (Plato )گرنگی دا بە جیــاوازی تاکــەکان لــە توانــای ئــەقڵی و کەســایەتییەوە،و پــۆلینی تیۆرێەکەی لەسەر تاکەکان لە جۆری کارکردنیان دابەش کرد بە سەر سێ جۆردا بەم شێوەی خوارەوە بو :-

1. هەندێ تاك هەیە کە کانزاکەیان ئاڵتونە (زێرە) gold
2. هەندێ تاك هەیە کە کانزاکەیان زیوە silver
3. هەندێ تاك هەیە کە کانزاکەیان لە مسە یان لە پۆڵایەCopper or steel

هەر وەها ئیفلاتون (Plato )جەختی لە سەرئەوە کرد کــە ئــەو کەســانەی کــە کانزاکانیان ئاڵتونە نمرەی زیرەکیــان زۆر تــرە وە ئەمــەش دادوەرەکــان ئەگرێتــەوە، وەیاریدەدەرەکانیان نمرەکەیان زیوە، و وەستا و پیشە سازەکان لە مس یان لــە پــۆلان،

ئەو منداڵانە کە لە دایك ئەبون ڕاستەوخۆ دەستنیشانیان بۆ ئەکردن بۆ زانینی کانزاکانیان، ئەوانی کە کانزاکەیان ئالتون بوایە بێ گوێ پێدان لە کانزای باوکەکانیان هەژمارەی ئەکردن بۆ ئەوەی بین بە دادوەر بۆ پاراستنی کۆمارەکەی . (Adamson&Verman1997)

وهەر وەها تیورەکەی ئیفلاتون بۆ ئەومنداڵانەی لەڕووی زمانەوانیەوە کەسایەتیەکی باشیان هەبووە لەوکاتەدا زوو هەڵ ئەبیژران وبابەتی تایبەتیان پێ ئەوتن لەڕووی زانست و فەلسەفە وفیزیاوە .

لە ساڵی1892) زانا جالتۆن (Galton) پەرتوکێکی بڵاو کردەوە بەناونیشان بلیمەت وبۆماوەیی (Hereditary Genius) و ناسنامەی دانا بۆ بلیمەتەکان،بەڵام ناسنامەکەی زۆر خسڵەتی بلیمەتەکانی لە خۆی نەگرتبو، ووای دەرخست کە بلیمەتی تایبەتمەندێکی بۆماوەییە و ژینگە هیچ کاریگەرێیە کی نیە لە سەری .

بەڵام بایاخ و گرنگ و پەرە پێدان بە فێرکردنی بەهرەداران لەو کاتەدا دەستی پێکرد کە زانا تیرمان(1877-1956) (Tearman)،، بیرۆکەی تەمەنی ئەقلی ڕونکردوە کە بە مانای گەشەی زیرەکی ئەقلی دێت، وپێوەری (ستانفورـ بینیە) بەکارهێناوە بۆی دەرکەوت کە سەرکەوتو وبەهرەدارەکان ئەو کەسانەن کە نمرەی زیرەکیان لە 135٪ نمرە کەمتر نەبێت بەپێی ئەو پێوەرە، وئەوانەش 20٪کۆمەڵگا ئەگرێتەوە، و وای بۆ دەرکەوت کە منداڵە بەهرەدارەکان ڕاهاتنی بەسۆزیان زۆرترە لەو منداڵانە کە تواناکانیان ناوندییە، وجەختی لە ڕێنمایی دایکان وباوکانی منداڵە بەهرەدارەکان کرد بۆ ئەوەی زیاتر لە توانا و پێداویستی منالەکانیان تێبگەن (Lefe&Darman;1999).

لە ساڵی( 1904) وەزیری خوێندنی گشتی فەرنسە داوای لە زانا (الفرید بینیە) (Alfred Binet) )کرد کە ناسراوە بە باوکی ڕوحی تاقیکردنەوەی زیرەکی( I.Q) بۆ ئەوەی پێوەریك دابنێت بۆ ئەومنداڵانەی کەوا ڕێژەی فێربونیان کەمە Slow learning وجیایان بکاتەوە لەگەل منداڵە ئاساییەکان .

لە سالی (1905 بینێەBinet لەگەڵ سیمون (SIMON) یەکەم تاقیکردنـەوەی زیرەکیان دانا و ناسراوە بـە تاقیکردنـەوەی بینیـە و لـە سـالی 1911 بینیـە بـە دواداچونێکی بۆ ئەو تاقیکردنەوە کرد، و وەرگێڕا بۆ زمـانی ئینگلیـزی و دابـەش کرا بەسەر زۆربەی ولاتاندا .

بەڵام لەو سـەردەمەدا لـە زۆربـەی وڵاتانـدا هـەوڵێکی زۆر بـاش درا بـۆ ئـەو بەهرەدارو سەرکەوتوانە کـە چـەند سـەنتەرو پـەیمانگا و خوێندنگـە ومامۆسـتای تایبەت هەبی و هەموو جۆرە خزمەت گوزارێـك و ئاسـانکارییان بـۆ ئـەکرێت لـە هەموو بوارەکانی ژیانەوە، وە چەند پێوەرێکی تـر دانـرا بـۆ زانـینی بیرکردنـەوەی داهێنەر کە چەند زانایەك هەڵسان بـەوکارە وەکـو : (جیلفـۆرد-ومیرفیـك 1960) و(تورانس-مینوایل1962) و(میـتزلبی جاکسون1962) ، چونکە کەسانی بەهرەدار ولیهاتو مایە و سەروەتی مرۆڤایەتین ئـەتوانن بـەرەنگاری هـەموو جـۆرە کێشـمە کێشیمو وململانەییەك بن، وهەر ئەوانیشن ڕەورەوەی مێژوو پـاڵ پێـوە ئـەنێن بـۆ بـەرەو پێشـەوە، وهـەر لەوانیشـەوەیە کـە زانـاو بیرمـەدان وسیاسـەتمدارەکان وسەرۆکەکان وداهینەرەکان دەرکەوتن کە بوون بەهۆی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی .

بەڵام بەداخەوە لە وولاتی ئیمە هیچ ئەو هەوڵ و ئامادە باشـیەکیان بۆنـەکراوە تەنها چەند قوتابخانەیەك نەبێت زۆربەیان قوتابخانەی تایبەتن کە هـەموو منـداڵێك توانای خوێندنی لەو قوتابخانانە نیە.

توێژەر و ڕۆشنبیرەکان وای دەرئەخـەن کـە خزمتگـوزاری و گرنگـی پێـدان بـە منداڵی بەهرەدار زۆر کەمە، ئەمەش بوە بەهۆی ئەوەی کـە ڕێژەیـەکی دیـاریکراو لەو منداڵانە لە قوتابخانە دابراون، یان هەنـدێکیان نمرەکانیـان لاوازە ..وهەنـدیکی تریان هەست دەکەن بەگۆشەگیری..هەست کردن بـە... بـەبێزاری لەقوتابخانـە... و تووشی خەمۆکی یان چەند نەخۆشیەکی تر ئەبن کە دەبیتە هۆی توشبوون بەفشاری دەروونی (strees) و هەستی و کۆمەڵایەتی وئەکادیمی تووش ئەبن.

هەروەها ژینگەی قوتابخانەکانیش کاریگەرێەکی زۆریان هەیە بۆ وازلێ هێنـانی هەندێ لەو قوتابیانە، چونکە ڕێژەیێکی زۆریان لە قوتابخانـە ئاسـایەکانا دەخـوێنن بەرەنگاری مامۆستای بێتوانا و کەموو کوڕی قوتابخانە و پەسەندنەکردنی ورەخنەی قوتابیەکانی تر ئەبنەوە .

بە هۆی نەبونی پرۆگرامی تایبەت وماموستای لێهاتوو و جۆری ڕێگەکانی وانە وتنەوەی تایبەت کە بگونجێت لەگەڵ گەشە کردنی ئەقلی منداڵی بـەهرەدار، و زۆر لە تویژینەوەکان دەریان خستوە کە (50٪) کاتی قوتابخانەکان بە فـیڕۆ و بێکـەڵك ئەچێتە سەر لەگەڵ ئەوقوتابیانەی کە ڕێژەی زیرەکیان لە 2٪ زیاترە.

**ئەو منداڵانە کێن کە پێیان دەڵێن بەهرەدار وسەرکەوتو؟**

منداڵی بەهرەدار ئەو منداڵەیە کە خاوەنی زیرەکیەکی زۆرەوە ڕێژەی زیرەکیـان لە کەوانەی زەنگۆڵێدا لەسەر (120)نمرەیە، وئەکەونە سەر بـەرزترین پایـەی هـەرە زیرەکەکان کە ڕێژەیان (2٪) لەناو کۆمەڵگادا، یان ئەومنداڵەیـە کـە بەهرەیـەکی زۆر دیاری کراوی هەیە لەهەر بوارێکدا بێت .

**ناساندنی ویپی 1972 لەگەڵ پەروەردەیی ئەمریکی :.**

شەش پۆلینکردنیان دیاری کرد بۆ سـەرکەوتووان و بـەهرەداران ، کـە لەوانەیـە سـودی هـەبێ بـۆ ئامادەباشـی پـەروەردەیی هـەروەها سـودی بـۆ مامۆسـتایانی سەرکەوتوان، و ئەو پەروەردەیە هەموو جۆرەکانی لای خوارەوە دەگرێتەوە وەکو:

- سەرکەوتوو لە بواری توانای ئەقلی بەگشتی ( زیرەکی گشتی ) .
- سەرکەوتوو لە بواری بیرکردنەوە و داهێنان و بەرهەم هێنان .
- سەرکەوتوو لە بواری بەڕێوبردن و سەرکردایەتی کردن .
- سەرکەوتوو لە بواری هونەری بینین و پیکهێنان .
- سەرکەوتوو لە بواری توانای جوڵە کردن .

**ناساندنی کۆمەڵەی ئەمەریکی بۆ فێرکردنی بەهرەداران 2013:**

بەهرەداران توانای زۆریان هەیە لەم بوارانــەوە : ( توانــای ئــەقڵی - کــارایی - ئەکادیمی – داهێنا– سەرکردەیی – هونەری – کارایی لە بوارەکانی جیاجیاوە ) .

## کەواتە منداڵی بەهرەدار :

**ئەو منداڵانەن کە تواناکانیان دەرئەبڕن بەشێوەیەکی توند لەهەر بوارێك لە بوارەکانی (زانیاری وجوڵەییدا، وەکو زوو فێربون وداهێنان و بیرکردنەوە لە زۆر بواری ترەوە) وەکو : -**

هونەرو.... میوزیك... و وێنە کیشان و... وەرزش و... هتد .

**خەسلەتەکانی بەهرەداران وسەرکەوتوان**

1. حەزێکی زۆریان هەیە بۆ بەدوا گەران .
2. ئامانجی بۆ خۆی داناوە وە هەوڵ ئەدات بۆئەوەی بهێنیتەدی.
3. لە هەندێك بابەت زۆر بە توانان .
4. زۆر بایەخ ئەدەن بە کات.
5. کەسایەتی خۆیان باش ئەناسن.
6. لە تەمەنی خۆیاندا گەورەتر دیارن .
7. توانای زۆر تێبینی کردنیــان هەیــە و هەســت بــە نــاوەڕۆکی شــتەکان دەکەن.
8. کارەکانیان بە تەنها و خێرا و زۆر بەباشی تەواو دەکەن.
9. کەسانێکن بە ئارامگری ولەسەرخۆو ئەناسرێن.
10. ئارەزویان زۆرە بۆ سەرکەوتن وپلەی نایاب لە خۆێندندا
11. توانای زۆریان هەیە لە ڕەخنە گرتن وگفتو گۆی بابەتەکان .

## پۆلینکردنی بەهرەدارو وسەرکەوتوان

أ- پۆلینکردنی ستانفورد بینێە Stanford Benet

1-ئاستی نایابەکان :

ئەوجۆرە کەسانە ئەگرێتەوە کە ڕێژەی زیرەکیان لە نیــوان ( 120-125) بۆ (135- 140) نمریە .

2-ئاستی سەرکەوتوەکان:

ئەوجورە کەسانە ئەگرێتەوە کە ڕێژەی زیرەکیان لـە(135 یـان140)بـۆ- (170) نمریە .

3- ئاستی زۆر سەرکەوتوەکان(بلیمەتەکان GENIUS )

ئەو کەسانە ئەگرێتەوە کە ئاستی زیرەکیان (170) نمرە وبەرەو ژوورترە.

## پۆلێنکردنی کرونشانك Kronshank:

1- زیرەکە سەرکەوتوەکان : ئەو کەسانە ئەگرێتەوە کـە ڕێـژەی زیرەکیــان لـەناو کۆمەڵگادا ( 5%- 10%)

2- بلیمەتەکان : ئەوکەسانە ئەگرێتــەوە کـە ڕیــژەی زیرەکیــان (135 – 140) هەتاکو(0 17) وە ئەمانەش پێکدێن (1%-3%) لەناو کۆمەڵگادا .

3-بلیمەتــە زۆر بــەهرەدارەکان: ئەوکەســانە ئەگرێتــەوە کــە ڕێــژەی زیرەکیــان (170%) و ئەمانــەش پێکــدێن 0.00001% لــەناو کۆمــەڵگادا . بــەمانای یەکێك لەناو سەد هەزار کەسدا ڕێژەکەیان زۆر کەمە .(جروان:2001)

دابەشکردنی ڕێژەی زیرەکی بەپێ پێوانەی بینیە-ووکسلر(نەخشەی 1)

| جــۆرەکان | نمرەی زیرەکی |
|---|---|
| دواکەوتنی ئەقلی زۆربەهێز | 24 - بەرەو وخوار |
| دواکەوتنی ئەقلی بەهێز | 25 -39 |
| دواکەوتنی ئەقلی ناوەندی | 40 -54 |
| دواکەوتنی ئەقلی ئاسایی | 55 -69 |
| گێل | 80 -70 |
| ئاستەنگی فێربوون | 90 -8 |
| ئاسایی-زیرەکی ناوەندی | 110-90 |
| سەرکەوتو | 120 -110 |
| زۆر سەرکەوتو | 130-120 |
| 130 وزیاتر | بلیمەت |

(سعيد:1995)




هێلکاری ژمارە (ا) دابەش کردنی ئاستی پلەکانی زیرەکی دەرئەخات

## کاریگەری بۆ ماوەیی و ژینگە لەسەر بەهرەمەندان :

هەندێ لە زاناکان جەخت دەکەن کەوا بەهرەمەندی ماوەییە و دیاری کراوە (هۆکاری جیيناتەکانە لە باوانەوە بۆنەوەکانیان دەگوازرێتەوە ).

بەلام زاناکانی قوتابخانەی ڕەفتاریەکان وە کو (جۆن واتسون John Watson ) جەخەت لەسەرئەوە ئەکات کەژینگە بەرگری و کاریگەرێیکی زۆری هەیە لەسەر نەهێشتنی توانستی زیرەکی، وهەر ژینگەیشە توانای گۆڕینی زیرەکی وبەهرەداری ئەکات .

بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە لە کاتێکدا منداڵ لە دایك دەبێت ئامادەی زکماکی هەیە بۆ بەهرەمەندی، بەلاّم دەبێت پەرەی پێدرێت و ژینگەکی چاك وخۆشگوزاری بۆدابین بکرێت هەتاکو ئەو بەهرەمەندیەی بەباشی پەرەی پێدرێت.

### جۆرەکانی بەهرەداران :

بەهرەداران دوو بەشن :

یەکەم : بەهرەداری گشتی :

ئەم جۆرە بەهرەداریە خۆی ئەگرێتە باری زیرەکی گشتی، وەزیرەکیش دەبێتە پێوانەی گرنگی بەهرەداری :هەر وەکو :بەهرەداری ئەکادیمی وخوێندن....

دووەم : بەهرەداری تایبەتمەندی :

ئەم جۆرە بەهرە دارانە لەکارێکی دیاری کراوا دەرئەکەوێت کە توانای ئیش وکارو بەرهەمنیانیان بە پلەیکی زۆر بەرز هەیە وەکو :

1_ زیرەکی زمانەوانی : (Verbal\ Linguistic Intelligence

ئەم زیرەکیە پەیوەندی هەیە بە زمان و خوێندنەوە هەیە و ئەو پرۆگرامە وردەیە کە لە سیستەمی پەروەردەدایە، و ئەم زیرەکیە لە زۆربەی ئەکتەرەکان و ڕۆژنامەنوسەکاندا هەیە .

2_ زیرەکی ژمێریاری : (Logic \ Mathematical Intelligence

یەکێك لە سیفاتەکانیان ئەوەیە کە بە بیرکردنەوەی زانستییەوە مامەڵەدەکات لەگەڵ بیرکردنەوەی بەرهەم ....و ئامادەکردن.... و ناسینی چەمکە سروشتیەکان ...و ئەم زیرەکیە لە لایان ...ژمێریاران... و پارێزەران.... و ئەوانەی کە لەکۆمپیوتەر زیرەکن .

3-زیرەکی بۆشایی بینین :. (Visual \ Spatial Intelligence

ئەم زیرەکیە لە هەستەوەری بینین دایە و توانای لەسەر خەیاڵ دروست کردن هەیە کە توانای دروستکردنی وێنەی خەیاڵی لە ناو ئەقڵیدا هەیە، و ئەم زیرەکیە زۆربەی جار لە کاتی وێنە کێشان بە دیار دەکەویت، وەکو ... ئەندازیاران ...و میکانیکی.... هونەر ...شێوەکاری....ئەگرێتەوە .



تەمەنی ئەو منداڵە سێ ساڵ کەمترە

**4-زیرەکی هەست بەجوڵەیی:( Body/ Kinesthetic Intelligence)**

ئەمەش لایەنی جوڵەیی دەگرێتەوە کە تاك چەند توانای نایاب و باشی هەبێ لە ڕووی جوڵــە کــردن ئــەم زیرەکییــە لــەلای ( وەرزش وانــان - داهێنــەران - میکانیکیەکانە) .

**5-زیرەکی میوزیك ژەن : (Musical/ Rhythmic intelligence)**

ئەم زیرەکیە بەوە ناسراوە کە کەسەکان توانای جیاوازیان هەیە لە جیاکردنەوەی دەنگی میوزیکی هەروەها ئەو دەنگەکانی کە لە ژینگەوە دێــن ، و ئــەم زیرەکیــە لەلای میوزك ژەنەکان... و دروست کەری ڕیکلامەکاندا هەیە .

**6-زیرەکی تاکی و کۆمەڵایەتی :.Interpersonal intelligence )**

ئەم زیرەکیە بــە دی دەکرێــت لــە ئــەنجامی دروســت کردنــی پەیوەندییــەکان و یارمەتی دانی کۆمەڵایەتی لە نیوان خەڵکەکان ئەم زیرەکیە بەدی دەکرێت لەلایــەن ....مامۆستاوکەسانی سیاسەت بازی ...و زانایان ...و پیاوە ئاینیەکان

**7- زیرەکی تاکی خودی**

ئەم زیرەکیە دەبەسترێتەوە بە دروست کردنی نمونەیەکی ڕاست و هۆشیار لەسەر خودی خۆی وەك زانینی بیرکردنەوەی ڕاست لەسەر خودی خــۆی و ئــەم توانایــە بــە کاریێنی لەسەر ژیانی خۆی دەبێت و ئەم زیرەکییە لەلایــەن پزیشــکانی دەروونــی و ڕێنماییکاران و توێژەرانی کۆمەڵایــەتی و ڕاهێنــەرەکان و ئــەو کەســانەی کــە نــە خشەکان دائەنێن.

**تایبەتمەندی بەهرەداران و بەهرەدارە سەرکەوتوەکان**

**1-تایبەتمەندی جەستەیی**

زانیارە زاناکان و جیاوازەکان وا دەرئەخەن کەمنداڵە سەرکەوتوەکان خاوەنی ... گەشــەی جەســتەیان زۆرتــرە لــە منداڵــە ئاســاییەکان .... وباڵایــان بــەرزترە ... وکێشیان زۆرترە ....وزوو گەشە دەکــەن لــەپیش منالــە ئاســایەکانەوە، هــەروەها لایەنی ... تەندروستی ....وجوڵەیی .... وبینیان زۆر باشــترە، و کــەمتر نــەخۆش

ئەکەون، و بەشێوەیەکی گشتی خەسڵەتەکانی خاوەنی ئەم تایبەتمەندیە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

1. تەندروستییان زۆرباشە وەگێشیان لە سەرماميناوندیە
2. ئەو منداڵانە کاتی لەدایك بوونیان کێشان زیاترە .
3. زوو فێری پاکو خاوێنی ئەبن
4. ئەو منداڵانە زۆر وریا و وشیارن
5. هەروەها لە منداڵی ئاسایی بەهێز ترن
6. توانا جوڵەیەکانیان زۆرە
7. بەکەمی توشی گوێ ئێشە وتەنگە نەفەسی ئەبن .

**2- تایبەتمەندیە ئەقڵییەکان**

زاناکان وای بۆئەچن کەوا منداڵە سەرکەوتوەکان گەشەیان باشترە لە منداڵەکانی تر لەهەموو بوارێکدا، بەتایبەت لەم خاڵانەی خوارەوە :

1. زوو پێ ئەگرن وە سەرپێ ئەکەون .
2. زۆر زوو زمانیان ئەکرێتەوە وە زوو فێری قسە کردن و نوسین ئەبن .
3. رێژە و پلەی نمرەکانیات بەرزترە لە منداڵە ئاسایەکان .
4. ئەگەر پرسیاریان لێ بکرێت زوو وەڵامی پرسیارەکان ئەدەنەوە .
5. چالاکیەکانی فراوانە وهەمەجۆرە،وئاست وخوازیان زۆرە .
6. پێشکەوتنی ئەقڵیان زیاترە .
7. دەیانەوێ زیاتر شت بزانن دەربارەی دەوروبەریان .
8. زۆر پرسیار دەکەن دەربارەی قۆناغەکانی ژیانیان .
9. زیاتر توانای خۆیندنەوەیان هەیە.
10. توانای زۆریان هەیە لە رەخنە گرتن وگفتوگۆکردن .
11. حەزێکی زۆریان هەیە بۆ بەدواداگەڕان بە دوای زانیارییەکان
12. سەرکەوتوون لە بواری بەرێوەبردن و سەرکردایەتی کردن

13. زیاتر بەشداری دەکەن لە چالاکیەکانی خوێندنی ڕۆژانە لە ناو پۆلدا

ئەم خالانە پێویست نیە لەسەر هەموو بەهرەدارێك پەیرەو بکرێ، پێویستە ڕەچاوی جیاوازی تاکایەتی بکرێن .

**3- تایبەتمەندی هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی :**

هەندێ توێژەرەکان وایان دەرخستوە کە منداڵانی بەهرەدار زیاتر داخراون وکەمتر بەشداری دەکەن لەچالاکی ژیانی کۆمەڵایەتی، بەڵام هەندێ توێژینەوە دەڵێن کە بەهرەداران هەندێ تایبەتمەندی گۆراوییان هەیە وەکوە:

1. بەهرەداران زیاتر کراوەن.
2. زیاتر ڕەخنە لە دەوروبەریان دەگرن.
3. زیاتر جێگیرن لەلایەنی هەڵچوونی و کۆمەڵایەتی.
4. زیاتر پەیرەوی یاسا دەکەن و کارەکانیان جێبەجی دەکەن.
5. زیاتر هەستیارن و هەست بە کەسانی تر دەکەن هەروەها هەست بە خۆشی ژیان دەکەن.
6. لای خەڵك خۆشەویستن.
7. زۆر هەستیارن هەندێکیان هەڵ ئەستن بەسەر پەریشتیاری جالاکیەکانی کۆمەڵەکەی .
8. هەمیشە پەیوەندی بەهێز لەگەڵ منداڵانی گەورەتر لەخۆیان دەبەستن.
9. ڕێز لە ڕای برادەرەکانی ومامۆستاکانی ئەگرێت.
10. -حەز ناکەن کە کەس دەستکاری ئیشەکەیان بکات .

**4- تایبەتمەندی زانیاری وفێربون**

منداڵی بەهرەمەدەکان تایبەتیان هەیە بە ڕەفتاری زانیاری کە لە قۆناغێکی گەشە کردنیانەوە زوو پێانەوە دەرئەکەویت، وچۆنیەتی پەرەوەردە کردنیان وبارودۆخی دەورو پشتیان ڕۆڵێکی زۆر گرنگ ئەبینن بۆ بەردەوام بوونی

بەهرەکەیان، وگرنگترین تایبەتمەندی زانیاری وفێربون لای بەهرەداران ئـەم خاڵانـەی خوارەوەن :-

**یەکەم : ڕێکخستنی هێمایی بیرۆکە موجەرەدەکان :**

ئەو بەهرەمەندانە توانایەکی توندرەو دەرئەخەن لەفێر بوونی زمـان وبیرکـاری و لە قۆناغیکی زۆر زوو لـە تەمەنیانـدا، و دایـك و بـاوك و مامۆسـتایەکانیان زوو هەستیان پێدەکەن .

**دووەم : زانیاریخوازی :**

ئەو منداڵانە هەر لە تەمـەنێکی زووەوە ئارەزویـان هەیـە کـەوا لـە جیهـان تێبگەن لە ڕێگەی تێبینەکانیانەوە وپرسیار کردنیانەوە کەپرسـیارەکانیان زۆر وردە ناگونجێت لەگەڵ ئاستی تەمەنیانەوە .

**سێیەم : سەربەخۆیی :**

تاکی بەهرەدار وسەرکەوتو ئارەزوی نیەکە کەس بەشداری بکات لە ئیشوکاری، چونکە هەوڵ ئەدا خۆی بە تەنیا تێبگات بـەبێ هاوکـاری و ڕێنمـایی مامۆسـتا و باوك و دایکیەوە، ئەمەش ئامـاژە بـەوە ئـەدات بەهـەبونی پاڵنـەری ناوەکیـەکان لەباتی پاڵنەرە دەرەکیەکان کە لەسەر پاداشت و سزادان ئـەڕۆن هـەر وەکـو بـەکار دێت لە گەڵ قوتابیە ئاساییەکان .

**چوارەم : وەرگرتنی بڕیار :.**

توانای وەرگرتنی بڕیار یان هەیە و دەتوانن پلان بۆ داهاتووی خۆیـان دابنـێن و وەرگرتنی بڕیاری کۆتایی و لەسەر بڕیارەکانیان سورن .

**پێنجەم : پلان دانان :**

دانانی شیوازی گونجاو بۆ جێ بەجێ کردنی بیرکردنەوەیەکی گونجاو .... ودیاری کردنی پێویستیەکان .....و دابین کردنی سەرچاوەکان .....ودانانی پلان ...بۆ جێبەجێ کردنی کردارەکان .

لێرەدا بۆمان دەر ئەکەوێت کە بەهرە داران وسەر کەوتوان تەنها پێویستیان بە چاودیری و یان دیاری کردنی پرۆگرامی پەروەردەی یان زانستی نیە، بەڵکو دەبێت ئەو چاودێری کردنە بەشێوەیەکی تەواو بێت واتە تێرو تەسەل بێت لە لایەنی... ئەقلی ...و زانستی... و جەستەیی ....وبیروهۆش.... وهەڵچونی....کۆمەڵایەتی ....و پێویستیەکانی گەشەکردن ...بۆ دروست بوونی بەهرەکەیان .

**جۆرەکانی بەرنامەی پەروەردەیی بۆ قوتابیانی بەهرەداران :**

**یەکەم : بەرنامەی خێراکردن ACCELERATION**

بەرنامەی خێراکردن ئەمەش مانای ئەوەیە قوتابی بەهرەدار بابەتەکانی پۆلێکی کەمتر لە سالیك ببڕێ وا تا ماوەی خوێندنیان کە متر بێت لە خوێندنی کەسانی ئاسایی، وسیستەمی بەرنامەو مامۆستا وانە وتنەوەکەیان جیاوازی دەبێت لەگەڵ قوتابخانە ئاسایەکان، ولە ماوەیەکی زوو خۆێندن تەواو بکەن لە ڕێگەی چەند ڕێگایەکەوە، وەکو:

1-وەرگرتنی ئەو منداڵانە لە باخچەی ساوایان وقوتابخانە بنەرەتییەکان پێش تەمەنی یاسایی .

2-هەنگاودان بەسەر پۆلدا، قوتابی ئەتوانێ هەنگاو بنێ بەسەر دوو پۆلدا بەیەك جاردا بۆ نمونە لە پۆلی دوو بۆ پۆلی چوار،

**دووەم : بەرنامەی دەوڵەمەند كردن (ENRICHMENT PROGRAM**

واتا دەوڵەمەند كردنی قوتابیانی بەهرەدار بە بابەتی زیادكردنەوەی سیستەمی خوێندن لە پاڵ بابەتی ئاساییەوە، و دانانی هەندێك چالاكی بە شێوەیەك كە یارمەتی گەشە كردنی بەهرەی ئەو منداڵانە بدات . و لە دانانی ئەو بەرنامەیە دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكرێت :

أ- جۆری ڕێگاكانی وانەوتنەوە Learning style.

ب- ئاست خوازو توانای خوێندنی ئەو قوتابیانە.

ج- دانانی پرۆگرامیكی چڕوپڕ كە گونجاو بێت بۆ ئەو بەهرەمەندانە.

د- راهێنانی ئەو مامۆستایەی كە هەڵدەستی بەو ئیشەوە.

**سێیەم: پۆلی تایبەت بۆ بەهرەدارو سەركەوتووەكان:**

(الزهراني:1999)

پۆلێكی تایبەتی بۆ بەهرەمەندەكان بكریتەوە لە ناو قوتابخانە ئاساییەكان، یان كۆكردنەوەی بەهرەداران لە پۆلێكدا بە تەواوی دەوامی ڕۆژانە و بەدریژایی ساڵ، وئەمەش دەرفەتێكی باش ئەدات بەو قوتابیانە كەوا تێكەلاو بن لەگەڵ قوتابییە ئاساییەكان كەلە زۆر كاتدا لە ناوگۆڕەپانی قوتابخانەكەدا ئەبیتە هۆی كارێكی كۆمەڵایەتی لە ناویاندا .

**3-فێركردنی بە تاك :**

مەبەست لەوەیە كە قوتابی بەهرەدار فێربكرێت بەشێوەیەكی تاكی، و لەبەر ئەوەی توانای منداڵەكان جیاوازە لە یەكترەوەكو توانای ئەقڵی یان توانای جەستەی یاخود حەزو ئارەزووەكان و سۆزداری، واتە هەر كەسێك بەهرەی خۆی هەیە و جیاوازی تاكایەتی بەدی دەكرێت .

پێویستە ڕەچاوی ئەم جیاوازی تاكایەتی بكرێت لە قوتابخانەكان چونكە هەر قوتابییەك توانای تایبەتی خۆی هەیە و هەریەك لەو قوتابیانە پێداویستی خۆی

هەیە بۆیە لێرەدا مامۆستا هەندێ ئامرازی تایبەتی بە کاردەهێنێت بۆ جێ بەجێ کردنی پێداویستەکانی تاکەکانی .

**کێشە وگیرو گرفتی بەهرە دار وسەرکەوتوەکان :**

منداڵانی بەهرەمەندان وسەر کەوتوەکان ئەناڵێنن بەدەست هەندێ کێشە وگیرو گرفت بەم یشێوەی خوارەوە :

1-منداڵانی بەهرەدار و سەرکەوتوەکان هەست بە جیاوازی دەکەن ئەمەش دەبێتە هۆی ناگونجاوی ورێك نەکەوتنیان لەگەڵ مدناڵە ئاسایەکاندا کە خۆیان بە زیاتر ئەزانن لە توانا ئەقلیەکانەوە، هەروەها منداڵە ئاسایەکانیش ناگونجێن لەگەڵ منداڵە بەهرەمەندەکاندا لە بوارەکانی ...کۆمەڵایەتی و کەسایەتیدا، ولەبەر ئەوە پێداویستەکانیان وەکو.... زانیاریخوازی.... و دۆزینەوەی زانیاری .....تێر نەکردنی بواری ئەقلی وسۆزیاریەوە .... دەبێتە هۆی بزرکردنی سۆز وجۆشیان. هەندی لەمنداڵە بەهرەمەندو وسەرکەوتوەکان توشی شڵە ژان و ناهاوسەنگی ئەبن کە دەرئەنجامی هەندێ نازناوە کە پێیانەوە دەلکێنرێت، هەندێ لە زاناکان (جالاجەر 1980) لای وایە کە ئەم ناوانە هەستی ....جۆراو جۆر ....وناتەواوی ..وەکو خۆشەویستی ...ورِق دروست ئەکات لای ئەو منداڵانە، وجەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەو منداڵانە بگەنە قۆناغی ناوەندی وهەرزەکاری لە بیری دەکەن، هەر وەها لەو قۆناغەدا سەرپێچی لەو نازناوانە دەکەن، و هەست وئارەزویان ئەگۆرێت وگرنگی ئەدەن بە داهاتو و گیرو گرفتە قوڵەکان، کە پەیوەندی هەبێت بە بەها ...و ڕەوشت ...وداد....وکێشە کۆمەڵایەتیەکان ...وهەژاری لە جیهاندا ....وگیرو گرفتی شڵەژانی خێزان ....ونەهێشتنی زوڵم و زۆرداری .

2-هەندێ لە منداڵە بەهرەمەندو وسەرکەوتوەکان هەست بە بێزاربوون وبێ ئارەزوویی لە وانەکانیان دەکەن، بەلایانەوە وایە کە ئەو بابەتە زۆر ئاسانە ناگاتە ئاستی توانا ئەقڵیەکانیانەوە، لەبەرئەوە بێزاری دەرئەبرن لە قوتابخانە.

3-مندالّی بەهرەدار لە ناو پۆلا هەندێ ڕەوشت ورەفتار نائاسایان لێ ئەوەشێتەوە بەرانبەر بە برادەرەکانیانەوە وەکو شەرانگێزی وئاشوب وفەرتەنە نانەوە، ئەمەش بەهۆی فەراموش کردنی توانا ئەقلّیەکانیانەوەیە.

4-فەراموش کردنی توانا ئەقلّیەکانی مندالّە بەهرەمەندو وسەرکەوتوەکان هەندێ جار دەبێتە هۆی دابزەێنی ئاستی خوێندنیان وە کەمی پالّنەر و ڕووخان خودی هەرچەندە ئەوان بەتواناو وسەرکەوتون .

5 -مندالّی بەهرەمەند زۆر تورە و وەرست ئەبن لەئەوەی خەلکان ڕای خویان ئەسەپێنن بەسەریاندا، وەهەست بە قورسی وپەسەند نەکردنی ڕەخنەی کەسانی تردەکەن .

6-مندالاّنی بەهرەمەند و سەرکەوتوو توشی شلەژان و گۆشە گیری وئاستیکی بەرز لە دلّەراوکێ ئەبن کەناتوانن پسپۆری بۆ خۆیان هەلّبژێرن یان کارێکی خوازراو بۆ خۆیان هەلّبژێرن، زانایان (بیرلی وجنشاف Birely 1991 &Genshaft جەخت لەوە دەکەنەوە کە مندالّی بەهرەمەند زۆر پێویستیان هەیە بە ڕێنمایی دەروونی وئەکادیمی،چونکە بە بێ یاریدەداری ڕێنمایی کار لەوانەیە کارێك هەلّ ئەبژێرێت پاش ماوەیەك بیگۆڕن چونکە ئەو ئیشە بەرزی خوازی تێرناکات . (القذافي :1996)

**ئامانجەکانی ڕێنمایی بەهرەدار و سەرکەوتووەکان**

بەرنامەی ڕێنمایی بۆ قوتابیە بەهرەمەندەکان بریتیە لە هەولّدان بۆ بە دیهێنانی گەشەکردنێکی ئاسایی وگونجانێکی ڕێك وپێك لە بوارەکانی... هەلّچوون... وزانستی... وکارکردن، هەروەها یارمەتی... دایك... و باوك... وماموستاکانێان ..بۆ تێگەیشتنی تایبەتمەندییەکانی قوتابیە بەهرەمەند وسەرکەوتوەکان، بۆ پەرەسەندنی ڕێگاکانی و مامەلّەکردنیان و بەدیهینانی پێداویستەکانیان .

## ئامانجی ڕێنمایی بەهرەدارو سەرکەوتوەکان بەم شێوەیە:

### یەکەم : ئامانجی ڕێنمایی گشتی

1. وردبونـــەوە لـــە کێشـــەکان و گرێمانـــە هەڵچـــوونێەگان کـــە بـــەهرەدارو سەرکەوتوەکان پێوەی گیرۆدە ئەبن و هەوڵدان بۆ زانینی کێشەکانیان .
2. دابین کردنی تەندروستی دەروونی بۆمنداڵە بەهرەدارو سەرکەو تووەکان و یارمەتیدانیان بۆ گونجاویان لە قوتابخانە و کۆمەڵگادا.
3. یارمەتیدانی منداڵە بەهرەدار وســەرکەوتوەکان بـــۆ پاراســـتنی لایـــەنی بەهرەکەیان .
4. ڕەخساندنی هەوڵی گونجـاو بـــۆ منداڵـــە بـــەهرەدارو ســـەرکەوتووەکان و یارمەتی دانیان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارانەی کە لەگەڵ بەهرەکـــەیان ئەگونجێ .

### دووەم : ئامانجی دەروونی

تێگەیشتن لە خوود وهەوڵدان بۆپەرپێدانی وئەمەش ڕۆڵێکی سەرەکی هەیـە بـۆ گونجاندنی بەهرەمەند لەگەڵ خوودی خۆی .

1. هەوڵ دان بۆ پەرەسەندنی وگەشەکردنی بەهرەکەیان .
2. یارمەتی دانیان بۆسەربەستی لە بیرو بۆچوون وگوزارشت کردنیان
3. دابین کردنی ئەمن وئاسایشی دەروونیان.

### سێیەم : ئامانجی هۆشیاری ژینگەی قوتابخانە :

1. پـــێش چـــاو خســـتنی قوتابیـــە بـــەهرەدار و ســـەرکەو توەکـــان لـــە نـــاو قوتابخانەکاندا کە ئەو قوتابیانە بەهرەیان هەیە .
2. هەوڵدان بۆ جیا کردنەوەی قوتابیـــە بـــەهرەدار و ســـەرکەو توەکـــان لـــە پۆلی قوتابیە ئاسایەکانەوە و، کۆکردنەوەیان لە پۆلێکی تایبەتدا .

3. ڕێکخستنی کاتی گونجاو بۆ ڕێنمایی بە کۆمەڵ لەگەڵ قوتابیە بەهرەدار و سەرکەو توەکان بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانیان .
4. هەوڵدان بۆ دابینکردنی ئەو مامۆستایانەی کەوا ئەزمونی باشیان هەیە و، خولی تایبەتیان بەدەست هێناوە بۆ ئەوەی لەو قوتابیانە تێبگەن وانەکانیشیان وا بێت پێداویستەکانیان تێر بکەن .
5. دانانی بەرنامە و پرۆگرامی چالاکی قوتابخانە لە ڕوی... هونەری .... وەرزشی ....وکۆمەڵایەتی ..تاوەکو بەو هۆیەوە لە تواناکانیان شارەزا بن بۆ ئەوەی ئامادە باشی بکەن لەبوارەکەیاندا و بەشداری کردنیان لە چالاکیەکاندا .
6. هەوڵدان بۆ چاککردنی ئاستی خۆیندن ...وتەواوکردنی ئەکادیمی .... و نائەکادیمیەکان، بەهرەدار پێویستی بە دابین کردنی کەش وهەوایەکە بۆ هاندانی بەهرەکەی .
7. گەشەپێدانی و لێوەشاوی چارەسەرکردنی ململانەکان ...و گیروگرفت ... و چۆنیەتی بڕیاردان لە فکرکردنەوەی و ڕخنەی دروستکەر و شیوەکانی دابەزینی دڵەڕاوکێ و شڵەژان .

**ڕۆڵی ڕێنماییکار بۆ منداڵانی بەهرەدار :**

منداڵی بەهرەدار و سەرکەوتوو زۆر پێویستیان هەیە بە ڕێنمایی لە هەموو قۆناغەکانی گەشەکردنیان، چونکە توشی کێشە وگرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی پەروەردەیی وخێزانی زۆر ئەبن، ودەرئەنجامی ئەمەش شڵەژان ونائارامی لێ ئەکەوێتەوە و کاری گەری زۆری ئەکەوێتە سەر بلیمەت وبەهرەکانیان، لە بەر ئەوە زۆر پێویستیان هەیە بە کەسێك کەوا دەستی یارمەتیان بۆ ڕاکێشیت و دەریان بهێنێت لەم شڵەژانیە کە بتوانن بگونجێن لەگەڵ خودی خۆیان وکۆمەڵگاکەیاندا، وئەم خالانەی خوارەوە ڕۆلی ڕێنماییکارە لە قوتابخانەدا :

1. ڕێنماییکار ڕێنمایی بەکۆمەڵ بۆدایك و باوکان و مامۆستایان بکات وبۆیان ڕوونبکرێتەوە و گرینگی و دەست نیشانکردنی ئەو خاڵانەی کەزۆرگرنگن و پێویستە جێەجێ بکرێت.
2. زانینی لایەنە نەرێیەکان و ئەوکێشانەی زیرەکەکان پێوەی دەناڵێنن لەدیدەنی مامۆستایاندا.
3. کۆبوونەوە لەگەڵ قوتابیە بەهرەدار و سەرکەوتووەکان وزانینی کێشەی قوتابخانەکان و ئەکادیمی لەدیدەنی قوتابیاندا .
4. کۆبوونەوە لەگەڵ مامۆستاکان بۆ گفتوگۆ کردن دەربارەی ئەو کێشانەی کە قوتابیە بەهرەدارەکان پێوەی دەناڵێنن، وهەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی .
5. ڕێنمایی کار دەبێت هەوڵ بدات کە هەمو تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی قوتابیە بەهرەمەندەکان بزانێت .
6. هەوڵ دان بۆ زانینی هەست ... و پێداویستی ....ئاراستەکانیان بزانێت،وە هەول بدات بۆ چارەرەسەری کیشەکانیان ...وزانینی تواناکانیان .
7. ڕێنمایی کردنی قوتابیە بەهرەدار و سەرکەوتوەکان بۆ ئەوەی بگونجێن لەگەڵ قوتابیە ئاسایەکان .
8. هەوڵ بدات کەوا ئەو قوتابیە بەهرەدار وسەرکەوتوانە تێبگەن کەوا تواناکانیان زیاترە وجیاوازیان هەیە لەگەڵ قوتابیەکانی تر، لەبەر ئەوە دەبێت ڕێز لە ڕا و تواناکانی ئەوانیش بگرن .
9. خزمەتگوزارییە ڕێنیشاندەرەکان بۆئەو قوتابیانەی پێویستیان بەمامۆستای هۆشمەند هەیە وچەندسودێکی زۆری هەیە بۆقوتابی لەم ڕوەدا .

**رۆڵی مامۆستای بەهرەداران**

1. مامۆستای بەهرەداران دەتوانێت هاندان لەسەر بنەمای بەردەوام بە قوتابیەکانی ببەخشێت .
2. -ئەو مامۆستایە دەبێت زۆر سەبری هەبێت و کاتێکی زۆر تەرخان بکات بۆ قوتابیە بەهرەمەندەکان .
3. ئەبێت ئەو مامۆستایە پرسیارو بیرۆکە نامۆکانی ئەو منداڵانە پەسەند بکات .
4. ئەبێت ئەو مامۆستایە بە دڵگەرمی هاوکاری بکات .
5. هەوڵ بدات کەوا نەیەڵێت شڵەژان لە ناو پۆلەکەیدا دروست ببێت .
6. مامۆستا دەبێت چالاکی زۆری هەبێت لە ناو پۆلدا وکاتێك کە پرسیاری لێ ئەکرێت هەوڵ بدات کەوا ژینگەیەکی گونجاو بۆ ئەو مناڵە دروست بکات بۆ زۆر کردنی ئەزمون و چالاکیەکانیان .
7. مامۆستای قوتابیە بەهرەدارەکان دەبێت کاتی زۆریان لەگەڵ بباتەسەر، بۆ ئەوەی بە وردی بیانناسێت، لە پێویستیەکانیان تێبگات.

## بەشی پێنجەم

## پەککەوتووەکان (المعوقون )

- کەسانی پەککەوتو کێن ؟
- هۆکاری پەککەوتوو :

یەکەم : هۆکاری پێش لە دایك بوون

دووەم : هۆکاری لە کاتی لە دایك بوون

سێەم :هۆکاری ژینگەیی :Environment

جۆرەکانی پەککەوتوو

شێوەکانی پەککەوتوو

ڕێنمایی بۆ خێزانی خاوەن منداڵانی پەککەوتووەکان

کێشەو فشارەکانی خێزانی خاوەن منداڵی پەککەوتووەکان

گرنگی ڕێنمایی خێزانی خاوەن منداڵانی پەککەوتووەکان

# بەشی پێنجەم:

## پەككەوتووەكان (المعوقون) Ubnormals

### كەسانی پەككەوتوو كێن ؟

بریتین لەو كەسانەی كەنائاسایین توشی كەمو كوڕی یان توانای جێبە جێ كردنی ئەركەكانیان نیە لەڕووی ....جەستەیی ...یان هەستی ...یان ئەقڵیەوە.

و مەبەست لە پەككەوتوو ئەوەیە كە... سیستەمی دەماری ناوندی ...یان ئێسكی كەلەی.سەریان....یان ماسولكەكانیان ...یان ئێسكەكانی تریان توشی زاماریەكی كەم یان زۆر بوون، و بەشێوەیەكی تایبەت ئەمانەش ئەبنە هۆی كەمووكوڕی ..رەفتاری...وخۆگونجاندن . وكاریگەری ئەكاتە سەر تەندروستی وباری كۆمەڵایەتی ودەروونی كە دەبێتە هۆی ناتەواوی لە بەشەكانی جەستە و جوڵانیان بەشێوەیەك كە نەتوانێت فێری هەندێ شتی دەست كەوتوبێت وەكوچالاكیە ئەقلیەكان یان جستەیەكان كە كەسانی ئاسایی پێ هەڵدەستن بەجۆرێكی شیاو وسەركەوتویی، وپەككەوتن نەخۆشی نیە بەڵكو دواكەوتنە لە گەشەكردنی یەكێك لە ئەندامەكانی جەستەیی .....

و ئەم جۆرە كەسانە بە خاوەن پێداویستە تایبەتمەندیەكان ئەناسرێن چونكە پێویستیان بەیارمەتیدانی كەسانی تر هەیە لەرووی پەروەردەیی.. و دەروونی.... و كۆمەڵایەتی.... و ....تەندروستی بۆئەوەی ئامادە بكرێن كە بتوانن بە ئاسودەیی ژیان ببەنەسەر... .

## هۆکاری پەککەوتوویی :

### یەکەم : هۆکاری پێش لە دایك بوون :

أ- بۆماوەی جینی : Genetics

هۆکاری جیناتەکانە لە باوانەوە بۆنەوەکانیان دەگوازرێتەوە، واتە سیفەتەکان لە باوك و دایکەوە بۆ منداڵەکانیان، یان لە ڕێگەی هەندێ کەموکورتی کەوا لە باوانیانەوەبۆیان ئەگەڕێتەوە.



ب-تێکچوونی کرۆمۆسۆمەکان، Chromosomes



کرۆسوم بریتیە لەدەستەیەکی ڕێکخراو کە زۆرینەی پێکدێت لە( (DNA) وئەکەوێتە ناوەرۆکی خانەکانەوە، ولەناو جەستەی هەمو مرۆڤێکدا( 23) جووت هەیە (22) جوتیان کە (44) کرۆمۆسۆمە جەستەییە و تەنها یەك جووتیان بۆ دیاری کردنی جۆری ڕەگەزی مندالە ئایا (نێرینە بێت یان مێ)، سەرەڕای ئەوەش ڕەگەمای تایبەتمەندیەکانی لە باوانەوە ئەگێرێتەوە بۆ نەوەکان وەکو....درێژی بالا ....رەنگی قژ وپێست ....رەنگی چاو.. ..

ئەو تایبەتمەندیانە کە کایگەری هەیە بە تەندروستیەوە وەکو .....نەخۆشیەکانی دل ....ئەندامەکانی جەستە ....و نەخوشی (شەکرە – فشاری خوێن و جۆرەکانی – وزۆر نەخۆشیتر....هەروەها بەرگریکردن لە دژی نەخۆشیەکان ...هتد.(سعید:1998)





**دووەم : هۆکاری کاتی لە دایك بوون :**

کۆرپە لە کاتی لەدایکبووندا تووشی چەند کێشەیەك دەبێت کە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر سەلامەتی وەکو : کەمی یان زۆری ئۆکسجین، یان خولانەوەی دەماری درکاوی بە ملیا، یان زۆر جار پێویستە کە هەندێ ئامراز بەکار دێت کەئەبێتە هۆی شکاندنی ئێسکی کۆرپەکە، وبەکار هێنانی شتی خاوێن نەکراو، هەروەها توشی چەند نەخۆشیەك دەبێت کە کاریگەری ئەکاتە سەرئەو کۆرپەیە لە

درێژی ژیانیا لە کاتی تێپەڕبونیدا بە کۆئەندامی زاوزێدا تووشی چەند نەخۆشیەك دەبێت لە دایکیەوە، وئەو نەخۆشیانەش وەکو :

1 - سورێژەی ئەڵمانی: RUBELLA

بریتیە لە نەخۆشیەکی ڤایرۆسی تەنینەوەیە زۆر زوو بڵاو دەبێتەوە و بە پرژینی کۆکەو پژمین ئەگۆێزرێتەوە، وئەگەر هاتوو تووشی دایکی سکپڕ بو لە سێ مانگی یەکەمدا ئەو کۆرپەیە (ئاوڵەمە) تووشی شێوان وکەموکۆڕی دەبێت وەتووشی چەند نەخۆشێك وەکو : کەم بینین و بیستن ....وشیوانی دڵ ...وئۆتیزم ....ونەخۆشی شەکرە .... ولاوازی دڵ ....لیکە ڕژێنی دەرەقی ... بیرکۆڵی ....وەئاوی سپی وشینی چاو .

2- نەخۆشی سۆوزەنەك (السیلان (GONORRHEA)

ئەم نەخۆشیە لە هەموو نەخوشێە سێکسیەکانی جیهان داپڕژاندنە، وە تووشی کۆرپە دەبێت لە کاتی لە دایکبونیا و دەبێتە هۆکاری کوێر بوونی ئەو مندالە .

3- نەخۆشی زوهری:

ئەم نەخۆشیە تووشی کۆرپە ئەبێ لە ناو منداڵدانی دایکی سکپڕدا لە ڕێگەی سوڕانەوەی خۆێندا، و ئەو کۆرپەیە تووشی زۆر نەخۆشی سامناك دەبێت .

4- نەخۆشی ئەیدز : AIDS

ئەێدز نەخۆشیەکە کە بەرگری لەش لاواز ئەکات وبەرەبەرە ئەیفەوتێنێت، وئەم نەخۆشیە بەردەوامە وزۆر سامناکە، تووشی کۆرپەکان دەبێت لە کاتی سکپڕبوون ولەدایك بووندا .

سێەم :هۆکاری ژینگەیی : ENVIRONMENT

لەهەندێ کرداری ژینگە دەست پێدەکات لەکاتی پیتاندنی هێلکە و هەتاکو دوای لەدایك بون، کاریگەری ئەکاتە قۆناغی منداڵی هەتاکو گەورە بونی ...وئەو

خەسڵەتانە کە پابەندن بە ژینگەوە و ڕۆڵی بۆماوەی تاڕادەیەك کاریگەری ناکاتەسەری وەکو : پێوەرو ڕەفتاری کۆمەڵایەتیەکان.... دابونەریت ... وبەهاکان، هەروەها ڕوداوە سروشتیەکان ...جەنگ وململانەکان ... بەر تیشك کەوتن...

نەخۆشی وەك ...سوریژەی ئەڵمانی ....نەخۆشی سێکسی (زوهری) کە تووشی دایك ئەبیت ...شیرپەنجە ...و نەخوشیە درێژ خایانەکان ....وکەمی ئۆکسجین لە کاتی لە دایك بوندا ....خواردنەوەی مادە هۆشبەرە وکحولیات جگەرەرە لەلایەن دایکەوە ....منداڵ بوون لەپیش کاتی ئاسایی خۆیدا... وهەموجۆرە ڕوداوەکان ونەخۆشیە ترسناکەکان کە تووشی منداڵان دەبێت ...هەروەها پیسی ژینگەی سروشتی وەکو هەوا.... ودوکەل.... وتۆزو خۆڵ.... وپیسی ئاو وئاوەرۆك ....



وەئەمانەش دەبێتە هۆی ناتەواوی ڕاهێنانی چالاکیەکانی و توانای تاك کە نەتوانێت پێداویستێکانی خۆی دابین بکات وهاتووچۆ کردن وجوڵە کردن بە شێوەیەکی تەواو، و هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسانی تر بکات و ژیانی کۆمەڵایەتی بە ئاسانی بباتە سەر .

## جۆرەکانی پەککەوتوو:

1. پەککەوتووی جوڵەیی ـ وجەستەیی
2. پەککەوتووی ئەقڵی (بیرکۆڵی )
3. پەککەوتووی هەستیاری

( نەبینان .. نەبیستان ..زمانەوانی ) (الرقب:2012)

## شێوەکانی پەککەوتوو :-

1. پەککەوتووی بەشێوەیەکی بەشی . Partial
2. پەککەوتووی تەواو. Complete
3. پەککەوتووی کاتی Temperoray
4. پەککەوتووی هەمیشەیی Permanent
5. پەککەوتووی کەمی (متناقص) Reducible
6. پەککەوتووی لە ڕادەبەدەر 0 (متزاید) Excessive

## کێشەی پەککەوتووەکان

**یەکەم : کێشەی دارایی :**

1. پەککەوتووەکان پێویستی زۆریان هەیە بە خزمەتگوزاری تەندروستی وەکو جاودێری کردنی پزیشك ودەرمان وهەندێ ئامراز بۆ چارەسەر کردن،وئەمەش زۆری تێ ئەچێت .
2. لەدەست چونی ئیش وکاری بەهۆی پشووی زۆر بۆپشکنینی پزیشکی.
3. زۆربەی جار نەبونی دارایی دەبێتە هۆی چارەسەر نەکردنی .

**دووەم : کێشەی کۆمەڵایەتی :**

کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت کەگەورەترین کێشەی ئەم چینە کێشەی گونجاندنی کۆمەڵایەتییە،چونکە ئەم چینە کێشەیان هەیە لە هەستەوەرەکانیان و

زۆربەیان یـەكێك یـان چـەند هەسـتەوەرێكیان لـە دەسـت داوە ئەمـەش كێشـەیە كەنەتوانن لەگەڵ كەسـوكاریان وهاورێكانیـان لـە قوتابخانـە وكەسـانیتر بگـونجێن، چونكە هەست بە كەموكوڕی دەكەن .

**سێیەم : كێشەی خێزانی:**

یـەكێك لەكێشـە هەرەگرنگـەكانی ئـەم جۆرەكەسـانە كێشـەی خێزانیـە چونكەخێزان ڕۆڵێكی گرنگی هەیە بەتایبەتی ئەگـەر دایـك و بـاوك ڕۆشـنبیریەكی باشیان نەبیت لەسەر چۆنیتی مامەڵەكردن لەگەڵیان. لێرەدا منداڵ بەدرێژی ژیـانی توشی یەكەم ڕەتكردنەوە، دەبێت لەلایەن كەسوكاریەوە بەهۆی ئەو بارەی كەپێـەوە ئەناڵێنی، هەر ئەمەشە دەبێتە هۆكاری ئـەو كێشـانەی كـە لـە داهـاتودا تووشـی دەبێت وەكو...هەست كردن بەكەمی...شەرانگێزی ...دڵەراوكێ خەمۆكی ...هتد.

**چوارەم : كێشەی هاوسەرگیری :**

كێشەی سەرەكی كەم ئەندامەكان كێشەی هاوسەر گیرییە،ئەویش تاكێكە وەكـو هەموو تاكەكانی ئاسایی مافی خۆشەویستی و وهاوسەرگیری هەیە هەست وسـۆزی لە دەست نەداوە، بەڵام لەبەر ئەوەی تووشی كەم ئەندامی بووە كۆمەڵگاكەمان زۆر بەچاوێكی بێ بەزەیی سەیری ئەم چینە ئەكات، دەسـتی یارمـەتی بۆدرێـژ ناكـات وكەسی یارمەتی نادات .

**پێنجەم :كێشەپەروەدەییەكان:**

كێشەپەروەدەییەكانی منـداڵی پەككـەوتوو ئـەم خالانـەی خـوارەوە لـە خـۆی ئەگرێت :

1. كەمی یان نەبونی قوتابخانەی تایبەت بۆ ئەو منداڵانە .
2. منداڵی پەككەوتوو لە قوتابخانـە ئاسـاییدا تووشـی نیگـەرانی ودڵ تـەنگی ئەبێیت .

3. توانای دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی نیە لەگەڵ هاوپۆل و مامۆستاکانیدا
4. هەمیشە پشت بە کەسانیترەوە ئەبەستیێ بۆ دابینکردنی پێداویستەکانی، و زۆربەی جار لەلایەن هاوپۆلەکانییەوە سەرزەنشت دەکرێت و گاڵتەی پێ دەکەن.
5. هەندی لەجۆرەکانی پەککەوتوو پێویستیان بەئامرازی تایبەت هەیە بۆ سەلامەتیان کە لە قوتابخانە ئاسایەکاندا نیە .

**شەشەم : کێشەی یاری کردن ورابواردن :**

بەهۆی پەککەوتووی جەستەیی وکەم کۆریەکانیانەوە ناتوانن بەشداری هاوپۆلەکانیان لە یاری کردنا بکەن، بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆی تەنگەرانی و خەفەت خواردن وهەست بەکەمی بێمتمانە دەکەن.

**حەوتەم : کێشەی پیشە وکار:**

زۆربەی پەککەوتووەکان بیێ پیشە وئیش و کارن، ئەگەر هاتو ئیش وکاریان دەست کەوت دەبێت بگونجێت لە گەڵ بارودۆخەکەیاندا، وناتوانێت بەباشی دەوام بکەن بەهۆی هاتوو چۆی پزیشك و نەخۆشخانەدا،لەبەر ئەوە هەمیشە چاوە ڕووانی ویارمەتی کەسانی ترن .

**هەشتەم : کێشە تەندروستیەکان :**

1. زۆربەی جار هۆکاری ئەو پەککەوتنە بە ئاسایی ڕون ئاشکرا نیە وئەبێتە هۆی بێزاری ئەو کەسەو خێزانەکەی .
2. چارەسەرکردنی ماوەیەکی زۆری ئەوێت وچارەسەکردنی زۆری تێ ئەچێت .
3. نەبوونی بنکەی تەندوستی تایبەت بۆپەککەوتوان بەپێی جۆرەکانیان.
4. کەمی ویا نەبوونی چارەسەری سروشتی پرۆفیشناڵ.

**كێشەی خێزانی خاوەنی منداڵانی پەككەوتووەكان :**

كێشەو فشارەكانی خێزانی خاوەن منداڵی پەككەوتوو:

زۆربەی ئەو خێزانانەی خاوەنی منداڵێ پەككەوتوون كۆمەڵێك كێشەو گرفتی تایبەتیان هەیە بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن كە ژیانێكی ئاسایی ببەنەسەر لەگەڵ ئەو منداڵە پەككەوتوانە،ولەهەمان كاتدا ئەو خێزانانە وەكو خێزانە ئاساییەكان لە كۆمەڵگادا تووشی هەمان كێشەو گرفتی ژیانی خۆیان ئەبن كە كێشە وفشاری وپێداویستەكانیان دوو جار زۆرترە بەتایبەتی كە پێیان ڕائەگەیەنن لە دایك بوونی ئەومنداڵە تووشی ڕاچڵەكێن shock ئەبن لەو جەبەرەبارودۆخە نوێیە كە چاوەڕوان نەكراوە، وئەوخێزانە پێویستی بەپشت گرتن وڕێنماییكردنە بە درێژایی ژیانیان .

**گرنگی ڕێنمایی خێزانی بۆخێزانی خاوەن منداڵانی پەككەوتوو:**

ڕێنمایی خێزانی خاوەن منداڵانی پەككەوتوو زۆر گرنگە بۆ دایك وباوك لەم خاڵانەی خوارەوە باس دەكەن:

1. بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخە نوێیەكانە وئاستەنگەكانی دەروونی وكۆمەڵایەتی باوك ودایك كەتوشی دەبێت بە هۆی ئەو فشارەوە كە لەسەر چاودێری كردنی منداڵی تازەپەككەوتوو .
2. یارمەتی دانی ئەو خێزانانەی كەمنداڵی پەككەوتوویان هەیە بۆ پێكهاتن لەگەڵ ڕۆڵی دەرەكی كە لە ناو خێزان دا ڕچاو بكرێت بۆ گونجاندنی لەگەڵ ڕفتارەكانی ئەو منداڵە پەككەوتووانە.
3. ئاڕاستەكردنی دایك وباوك بەو دەزگا پەروەردەیی و كۆمەڵایەتی و تەندروستی كەوا یارمەتی تاكەكانی ئەم جۆرە پەككەوتوانە ئەدات .
4. ئارستەكردنی یان پابەند بوونی دایك وباوك بەو پیشەو كارەی كە هەیە لەناو ژینگەدا وڕاهێنانی گونجاو بۆ ئەو پەككەوتووانە كە جیگرین لە باری ئابووریەوە

5. یارمەتی دانی کەسی پەکەوتوو لەسەر تێگەیشتنی و ڕێزگرتن لەخودی خۆی وهەوڵ دان بۆ کەمکردنەوەی باری دەروونیەکەی .
6. زانینی توانا جەستەیی و ئەقڵی و کۆمەڵایەتی و پیشەییەکانی و پێش خستنی ئاراستە ئەرێنیەکانی بۆ لای خۆی .
7. کەم کردنەوەی دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و دوو دڵی کەمنداڵە پەککەوتووەکە بەدەستیەوە ئەناڵێن و ڕێکخستنی هەست و سۆز و هەڵچونەکانی.
8. گۆڕینی هەندێك لەهەڵسوکەوت و ڕەفتاری نا دروست .
9. یارمەتی دانی لەگەشە کردنی بەهاو ڕێزگرتنی خود وهەوڵ دان بەدەستهێنانی بەرزترین توانا لە پلەکانی ئامانجەکانی .



# بەشی : شەشەم

## بیرکۆڵان (پەککەوتوی ئەقڵی)

- بیرکۆڵان کێن ؟
- پێ ناسەی بیرکۆڵان

1 -پێناسەی پزیشکی

2-پێناسەی پێوانی دەروونی سیکۆمەتری(I,Q )

3- پێناسەی کۆمەڵایەتی

4-پێناسەی کۆمەڵەی ئەمەریکی بۆبیرکۆڵان

5 -پێناسەی پەروەردەیی بۆبیرکۆڵان

هۆکارەکانی بیرکۆڵی

پۆلینکردنی بیرکۆڵی

پۆلینکردنی بیرکۆڵی بەپێی شێوەی دەرەکی

تایبەتمەندیەکانی بیرکۆڵان

دەست نیشانکردنی بیرکۆڵی

ڕێنمایی بۆخۆپاراستنی منداڵان بە تووش بوون لەبیرکۆڵی

ڕێنمایی پەروەدەیی بۆ خێزانی منداڵانی بیرکۆڵان

ڕێنمایی گشتی بۆ خێزانی منداڵانی بیرکۆلان

# بەشی:شەشەم:

## بیرکۆلی (پەکەوتووی ئەقڵی) Mental Impairment

### بیرکۆڵان کێن ؟

بریتین لەوکەسانەی کە کەمیان هەیە لە نمرەکانی زیرەکیدا، زۆرجار هۆکاری بۆ ماوەییە یان کاریگەری نەخۆشی و ژینگەییە، کە دەبێتە هۆی وەستاندنی خانەکانی مێشك .

خشتەی (2) پێ ناسەی بیرکۆلان

| | |
|---|---|
| پێناسەی پزیشکی | روو ئەدات بەهۆی کەمی ئەقلی دەرئەنجامی خراب خۆری یان نەخۆشیەکانی مێشك . |
| پێناسەی پێوانەی دەروونی سیکۆمتری | ئەو منداڵانەی کە نمرەی زیرەکیان لە 75 کەمترە |
| پێناسەی کۆمەڵایەتی | کارکردنی تاك لەبوارە کۆمەڵایەتیەکانەوە |
| پێناسەی پەروەردەی | بریتیە لە گونجاندنی ژینگەی فێرکردن و توانین بۆجێبەجێکردنی پێداویستە فێرکاریەکانی |
| پێناسەی کۆمەڵەی ئەمەریکی | پەکەوتووی ئەقلی بریتیە لە کەمایەتیەك تارادەیەکی زۆر لەفەرمانەکانی ئەقل و،رەفتاری خۆگونجاندن |

ا-پێناسەی پزیشکی : MEDICAL –DEFINITION

پەککەوتووی ئەقلی ڕوو ئەدات بەهۆی کەمایەتی تەمەنی مێشـک دەرئـەنجامی تێکشکاندنی ناوەندی دەمارگیری پێش یان دوای لەدایك بوون ڕوو ئەدات

2-پێناسەی پێوانی دەروونی( سیکۆمەتری( I,Q ) ) PSYCHOMETRIC ( DEFINITION

پێناسەی پێوانی دەروونی پشـت ئەبەسـتێت بـە ڕێـژەی زیرەکـی (I,Q ) بـەپێ پێوانەی ستانفورد و وکسلر، وارەچاو ئەکرێت کە ئەو کەسانەی ڕێژەی زێرەکیان لـە (75) کـەمتربێت پەککـەوتوی ئـەقڵێن یـان بیرکـۆڵن، بـەپێ کـەوانی زەنگـۆڵی (کریفر،لیندا:2004).




هێلکاری ژمارە (2) دابەش کردنی ئاستی پلەکانی زیرەکی دەر ئـەخات بـەپێی پێوانەی ستانفورد و وکسلر

نەخشەی ( 3) ڕیژەزیرەکی بە پی پێوانەی وکسلر

| | جــــــۆرەکانـــــی بیرکۆڵــــــــــــی | ریـــژەزیرەکی بـــە پێـــی پێوانەی وکسلر |
|---|---|---|
| 1- | بیرکۆلی سادە(مورۆن) Mild | 55-69 |
| 2- | بیرکۆلی ناوەندی (ابلە) Moderate | 40-54 |
| 3- | بیرکۆلی بەهێز (معتوە) Severe | 25-39 |
| 4- | بیرکۆلی زۆر بەهێز Profund | 24 بەرەوخوارتر |

### 3- پێناسەی کۆمەلأیەتی( SOCIAL DEFINITION)

پێناسەی کۆمەڵایەتی جەخت ئەکاتە سەر سەرکەوتن یان ناسـەرکەوتنی تـاك لە وەلام دانەوەی پێویسـتیە چـاولێکراوکانی کۆمەڵایەتیـەکان، گـەرهاتو بـەراورد بکرێت لەگەڵ هەمان هاوتەمەندا،و هەر تاکێك نـەیتوانی ئەرکـە کۆمەڵایەتیـەکان جێبەجێ بکات وا ڕەچاودەکرێت کەبیرکۆڵە .

### 4-پێناسەی کۆمەڵەی ئەمەریکی بۆبیرکۆلان:_ THE AMERICAN ASSOCIATION ON MENTAL RETARDAION، ( AAMR ) ( DEFINITION ) )

پەکەوتووی ئەقلی بریتیە لە کەمایەتیەك تارادەیەکی زۆر لەفەرمانەکانی ئەقل و، ڕەفتاری خۆگونجاندن ولە تەمەنی پیش (18)ساڵیدا دەر ئەکـەویت،و نهامەنـدی وخۆکشانەوەیەکی دیاریکراو لە توانا ئەقڵیەکانەوە لە مامناوەنـدی زیرەکیـەو (75 +5) هەروەك لەم کارامانەی بەدی دەکرێت :_

1-کـارامی تێگەیشـتن (چـەمکەکان) ... زمـان.... نوسـین.... خوێنـدن.... تێگەیشتنی ئەقلی ... (ئاراستە مادیەکان)

2- کارامەی کۆمەڵایـەتی (کەسـایەتی ....بەرپرسـیارەتی ...بەدەسـتهێنانی خود....

5-پێناسەی پەروەردەی بۆپەککەوتوی ئەقڵی :

بریتە لە گونجاندنی ژینگـەی فێرکـردن و تـوانین بۆجێبـەجێکردنی پێداویسـتە فێرکاریەکانی، بە شێوەیەك کەبگونجێت لەگەڵ تواناکانی پەکـەوتووی ئـەقلی، کـە پێویستی بەشێوازێکی کارای زیـاتری هەیـە لەفێرکردنـدا، وە پـۆلین کردنیـان بـەم شێوەیە :

ا-ئەو بیرکۆلانەی توانای فێرکردنیان هەیە (مورون)(70 –0 0 5) پلە، ئەتوانن فێربونی کارامەیکی سەرەکی بن.

2-ئەوانـەی توانـای ڕاهێنانیـان هەیە(أبلـە)(50-30) پلـە توانـای فێـری پاکوخاوێنی خودی خۆی بکات . (نصرالله:2005)

3- پەککەوتوەکان (معتوە) (30 کەمتر )پلە پێویستان بـە چـاودێری تایبـەت بەردەوام هەیە .





منداڵی بیرکۆل

## هۆکارەکانی پەکەوتووی ئەقلی:_ (Mental Retardaion Causes

پەکەوتووی ئەقڵی بەشیوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆکـاری سـەرەکی لە خۆدەگرێت هەریەك لەم هۆکارانە کاریگەریەکی گـەورەیان هەیـە لەسـەر ژیـانی مرۆڤ.:-

### هۆکارەکانی پەکەوتووی ئەقلی

ئەم هۆکارانە دابەش ئەکرێ بەسەر سێ جۆردا :

| | | |
|---|---|---|
| هۆکاری پێش لە دایك بوون | هۆکاری کاتی لە دایك بوون | هۆکاری دوای لە دایك بوون |

هێلکاری(3) هۆکارەکانی پەکەوتووی ئەقڵی

### یەکەم : هۆکاری پێش لە دایك بوون:

ئەم هۆکارانەش دابەش ئەکرێ بە سەر چەند هۆیەکدا :

هۆکاری پیش لە دایك بوون

| هۆکاری جیناتە بۆماوەییەکان | | هۆکارەکانی ناو ڕەحم | | |
|---|---|---|---|---|
| ئاستی توانا ئەقڵیەکان | بارودۆخی نەخۆشیەکان | کەمی خۆراك | زوهری | مەوادی کیمیاوی |
| هۆکاری جیناتە سستەکان | لادانی کرۆمۆسۆمەکان | تیشکیX | پیسبوونی ئاو هەوا ژینگە | هۆکاری خوین رایزس Rh |

هێلکار(4) هۆکاری پێش لە دایك بوون

## هۆکاری جیناتە بۆماوەییەکان HEREDITARY

هۆکـاری بۆمـاوە ڕۆڵێکـی گرنگـی هەیەلـە دروسـت بـون و گواسـتنەوەی نەخۆشیەکان لەباوانەوە بۆنەوەکانیان .وەیەککەوتوی ئەقلی ئەگوازرێتـەوە بەهـەمان شـێوە لـە ڕێگـەی جیناتەکانـەوە وەکـو گواسـتنەوەی خەسـڵەتە جەسـتەی و دەروونیەکانیتر وەکو ڕەنگی قژ وچاو وپێست دریژی باڵا قەڵەوی و....... .

مەبەستمان لەهۆکاری بۆماوەی هۆکاری جیینانەکانە لە باوانـەوە بونـەوەکانیان دەگوازریتەوە لەریگای کرۆمۆسۆنەکان کە 23 جوتن دەکاتـە 46 کـە نیـوەی هـی باوکن نیوە شیان هی دایك پیك دین بە سێ شێوە:



1_جیناتە زاڵەکان

2_جیناتە گواستنەوەکان

3_جیناتە ستەکان 0(متنحیە)

کەواتە دەرکەوتنی ئەونیشانانە دەست پیدەکات بە بچوکی کێشی مێشك کە لە لەمنداڵدا دەرئەکەوێ بەهۆی جیاوازی کاریگەری (RH FACTOR) کـە یەکێکـە لە هۆکارە گرنگەکانی پێکهاتەی خوێندا دەرئەکەوێ لە هـەر تاکێکـدا کەسـیفەتی بۆماوەی جیناتی زاڵ و جێاوازی لە جۆری خوێنی دایك و باوك بە تایبـەتی ئەگـەر خوێنی باوك پۆسیتڤ بێت و خوێنی دایکی نیگەتیڤ بێت یان بەپێچەوانەوە .

رۆڵی هۆکاری ژینگەیش کەم نیە لەسەر ژیانی مرۆڤ ئەم هۆکارلە کاتی پێتاندنی هێلکە دەست پێ ئکات، واتە لیرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە کاریگەری ژینگەی جیاوازە لەژینگە یەکەوە بۆژینگەیەکیتر.

لەوکاتەی منداڵ لەناوسگی دایکی دایە پێش لەدایك بوون ودوای لەدایك بونی ژینگە کاریگەری لەسەر هەیە، هەر وەها لەکاتی قۆناغی منداڵییدا بەم شێوەیە:.

**قۆناغی پێش لەدایك بون:**

ئەوهۆکارە ژینگەیانەی کە کاریگەریان هەیە لەسەر منداڵ پێش لەدایك بوون ئەم خالانەی خوارەوەن:

1. کەمی هەندێ لە خواردنە سەرەکیەکان کە زۆر پێویستە بۆ ئافرەتی دووگیان وەکو: فیتامینەکان ....کالیسیۆم ....کاربۆهیدرات ... فیتامینەکان.. .جۆرەکانی خوێ .کانزاکان..شیرینیەکان ...... .
2. هەندێ نەخۆشی کەتوشی ئافرەتی دووگیان ئەبێ وەکو... ئاوڵە ... سورێژەی ئەڵمانی ....شەکرە ...فشاری خوێن....تەلەسیمیا وزۆربەی نەخۆشیەکانی خوێن Rh- ....زوهری.....
3. بەکارهێنانی ئافرەتی دووگیان مادە هۆشبەرەکان وکحولیەکان وجگەرەکێشان.
4. خراپی ژینگە پیس بوونی ئاو کە کرداری هەیە لەسەر ئافرەتی دووگیان .
5. بەکار هێنانی ئافرەتی دووگیان هەندێ دەرمان بەبێ پرسی پزیشك .
6. بەرکەوتنی ئافرەتی دووگیان لە جۆرەکانی تیشك وەکو تێشکی X.
7. زانا (بنروز) جەخت ئەکات کە ئەو منداڵانەی دایك وباوکیان بیرکۆڵن ئەوانیش بیرکۆڵ ئەبن وەبیرکۆڵی بۆماوەییە ئەگوازرێتەوە لە باوانەوە بۆ نەوەکانیان لە رێگای جینە سستەکانەوە لە هاوسەرگیری خزماندا دەرئەکەویت.

دووەم : قۆناغی کاتی لە دایکبوون

قۆناغی کاتی لە دایك بوون

| منداڵ بوونی ناڕەحەت | منداڵ بوون لە پێش کاتی خۆیدا | کەمی ئۆکسجین | برینداری جەستەیی | هەوکردنی مێشك |
|---|---|---|---|---|

خشتەی (5 ) قۆناغی کاتی لە دایکبوون

**کاریگەری مەترسی منداڵ کاتی لە دایکبوونددا:**

1. منداڵ بوون لە پێش کاتی خۆیدا.
2. کەمی کێش کۆرپەکە.
3. لەکاتی لەدایکبوونی منداڵا کە ڕێژەی ئۆکسجینی کەمە، لەبەرئەوەی ئەومنداڵە هێشتا ئەندامەکانی جەستەیی پێنگەیشتوە وپێویستی بەئۆکسجین هەیە (اطفال الخدج)، لە کاتی پێ دانی ئۆکسجین گەرهاتوو ڕێژەکەی زۆر بو کاریگەریەکی زۆر ئەکاتە سەر مێشکی کۆرپەکە و تووشی بیرکۆلی ئەکات .
4. لەکاتی بەکارهێنانی ئەمرازەکانی لەدایکبووندا کەللەی سەری منداڵەکە ئازاری پێ ئەگات یان تووشی برینداری جەستەیی دەبێت .
5. زۆر جار کۆرپەکە لەکاتی لە دایکبوندا تووشی خنکاندن وکۆستی دەروونی دەبێت بەهۆی کەمی ئۆکسجینەوە ..
6. گواستنەوەی هەندێ نەخۆشییە سەخت وسامناکەکانەوە لەدایکەوە بۆ کۆرپەکە لەکاتی لە دایك بووندا .

**سێیەم : کاریگەری هۆکارەکان دوای لەدایکبوون:**

**خشتەی( 6 ) هۆکارەکانی دوای لە دایك بوون**




1. زۆر جار منداڵ لە شۆینی بەرز ئەکەوێت بەسەرسەریا کە توشی ئیفلیجی دەبێت، لەوانەیە ببێت بە بیرکۆڵی .
2. تووشبوونی منداڵ بەنەخۆشی هەوکردنی مێشك(السحایا) زیان ئەگەیەنێت بە کۆئەندامی دەماری ناوەندی مێشك کەمنداڵەکە تووشی بیرکۆڵی دەبێت.
3. -هەر جۆرە فشارێك بکەوێتە سەر منداڵ لە کاتی لە دایك بووندا کاریگەری هەیە بۆ مێشکی ئەو منداڵە .
4. کاریگەری هەندێ ڤایرۆس کە دەبێتە هۆی تووش بوونی منداڵ بەچەند نەخۆشیەك وەکو.... سورێژە... و ملەخرە... وکۆکە ڕەشە.... کەوا زۆر کاریگەری ئەکاتە مێشکی کەدەبێت بە هۆی پەککەوتووی ئەقڵی ئەو منداڵە .
5. هەندێ ڕووداو کە تووشی منداڵ دەبێت وەکو :

أ- ژەهراوی بوون(تسمم)لە کاتی لە دایکبوون.

ب- خنکاندن لە کاتی نوستندا .

ج- سوتاندن و نوقمبوون لە ناو ئاودا وڕووداوی سەر شەقام.

## پۆلێنکردنی بیرکۆڵی بەپێ شێوەی دەرەکی

1. دیداری داون DOWN'S SYNDROME (مەنگۆل (MONGOLSIM)

نـاوی مــەنگۆلی بـەو منداڵــە بیرکۆڵانــە ئـەوترێ تـەنها شـێوەی دەرەکیـان (جەستەیی) لەرەگەزی مەنگۆلی ئەچێت، ئەم خەسڵەتانەیان هەیە، وەکو: قلیشانی زمانیان ...وسەری بچووك ...چاوی بادەمی وپێڵە چاوی ئەسـتور ...بـرۆی پـڕ... لوتی بچووك وپان ... زمانی پان...دەستی کورت وپـان ..پەنجـەی بچـووك.. ملـی کورت.. . بە هـۆی زیـاد بـوونی یـەکێك لـە کرۆموسـۆمەکانی (46 کرۆسـوم + 1کروسوم = 47)؛.

هەروەها منداڵی مەنگۆلی ئەناسرێت لە پێش لە دایك بووندا ولەکاتی لە دایك بووندا،و تووش بوون بە مەنگۆلی هۆی سەرەکی تەمەنی دایکەبە تایبەت لـە دوای 38ساڵیدا .



**2- کەیسی کورتە بالاکان (کەمی لیکەرژێنی دەرەقیە )**

درێژی باڵای ئەو منداڵە بیرکۆلانە لە هیچ کاتێکدا تێپەر ناکات (60ـــ70) سم لە قۆناغی هەرزەکاریدا،ئەمەش هۆکاری نەبونی لیکەرژێنی دەرەقیە، یان کەمی مادەی (تیرۆکسین)ە، خەسڵەتەکانیان :

أ- زۆر تەمبەڵن .

ب- دانیشتن وهەڵسوکەوتیان زۆر قورسە .

ج- .زۆر زوو چرچولۆچی پێستیان پێوە دەر ئەکەوێت..رەنگی پێستیان مەیلەو زەردە.

د- دواکەوتوون لە قسەکردنا . (الوزانە:2005)

**3- گەورەیی قەبارەی کەلەی سەر**



ئەم جۆرە منداڵانە ئەناسرێن بە گەورویی کەللەی سەریانەوە، لە هەفتەکانی یەکەمەوە لە پاش لە دایك بوون بەرچاو ئەکەوێت، وئەمەش هۆی زۆری شلی برپرەی مۆخە کە خانەکانی مێشك تێئەشکێنێ و شلە ژانێکی زۆریان هەیە لە ئاستی بینیندا .

4- قەبارەی سەری بچووك



ئەو منداڵانەی قەبارەی سەریان بچووکترە لە منداڵانی ئاسایی وتوانای فێربوونی زمانیان نیە وچالاکی جووڵەیان زۆرە و، تەمەنیشیان کورتە.

تایبەتمەندیەکانی پەککەوتوانی ئەقڵی بیرکۆلان

1-تایبەتمەندیە جەستەییەکان:

أ- بە شێوەیەکی گشتی پەککەوتووە ئەقڵیەکان گەشەی جەستەیان کەمە لە قەبارە .

ب- درێژی جەستەیاندا لە کەسانی ئاسایی کورت ترە.

ج- کێشەی قەبارەی مێشکیان کەمترە لە مامناوەندی.

د- زۆربەی جار تێکچون بە چەوری دەست پێدەکات لە سەر شێوەی جەستەیاندا.

ھ- لە زۆربەی کاتەکاندا پلەی پەککەوتوییە توندەکان لەسەر.ودەم وچاو...وسەرپەنجەکانیان و دەردەکەوێت .



**2- تایبەتمەندیە ئەقڵیەکان :**

پەککەوتووانی ئەقڵی بە دەست کـەمی ڕێـژەی زیرەکـی و پـەرتبوونی بـیرەوە دەناڵێنن.ئەمەش ڕاڤـەی کـەمی پەیوەنـدیان دەکـات لـە هەڵوێسـتی فێربوونـدا، کاتێکی زۆری پێویستە بـەڵام هەڵوێسـتی فێربـوون ماوەیـەکی مامناوەنـدی یـان گونجاو دەخایەنێت بۆ کەسانی ئاسایی.بەهەمان شێوە لە پرۆسە ئەقڵیەکان وەکو... بیرهاتنەوە ...وئاگـاداری ...وهەسـتیاری ...وخـەیاڵکردن ....وفکرکردنـەوە ... تێگەیشتن ...وهتد، دەتوانین بڵێین کـە ئەمانـە پرۆسـەیەکی گـرنگن بـۆ پرۆسـەی بیرهاتنەوە بۆیە لە ئەنجامدا لاوازیی لە خوێندن وفێربونیان هەیە .

**3- تایبەتمەندیە زمانەوانیەکان:**

واتە پەککەوتووانی ئەقڵی بە شێوەیەکی گشـتی لـە گەشـەی زمانەوانیـدا زۆر خاون ئەم خاوییەش لە قۆناغەکانی منداڵی زوودا تێبینی دەکرێت، و لەوانەیە کـە بە ئاستەنگ زمان فێـر دەبـن وەکـو (تاتـا) . و لـەکاتی قسـە کردنـدا گونجـاوی دەنگیاندا هەڵە هەیە، و لە گرنگترین ئەو کێشانەی کە ڕووبـەڕوی پەککـەوتووانی ئەقڵی دەبێتەوە پەیوەندی دارن بە تەواوی زمـان و بـوونی زاراوە لـە ئەقڵیانـدا، و تێبینی دەکرێت کە ئەوە زاراوانەی بەکاریان دەهێنن کە زاراوەی زۆر سادەن لەگـەڵ تەمەنی کاتیاندا ناگونجێت.

**5- تایبەتمەندیە هەڵچوونی و کۆمەڵایەتیەکان:**

جیاوازیەکی زۆر لە پەککەوتوانی ئەقڵیدا دەبینرێت لە تایبەتمەندیە هەڵچـوونی و کومەڵایەتیەکانیاندا، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ گرێدانی سیفەتە هەڵچوونیەکان بە هۆکارەکانیانەوە.،تایبەتمەندیە هەڵچوونی و کۆمەڵایەتیەکان ئەگەڕێتەوەبۆ سەر جۆری ئەو کار لێ کردنەی کە لە نێوان کەسی پەککەوتووی ئـەقڵی و ژینگەکەیـدا ڕوئەدات.

بیرکۆلاَن بەم سیفەتانە وەسف دەکرێن:

1- کشانەوە، ورەفتاری دووبارەیی.

2- جم و جوڵ،چـالاکی لـە ڕادده بـەدەر، ناتوانیـت کـۆنترۆڵی هەڵچـوونەکانی بکرێت .

3- لەگەڵ بوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی کارا لەگەڵ ئەوانی تردا.

4- ئارەزوو لەسەر بەشداریکردنی تەمەن بچووکترهەیە لە چالاکیەکاندا .

5- ڕێز نەگرتن لە خود.

6- هەست نەکردن بە ئەمن و (ئاسایش) .

7- توانای پاکوخاوێنی خودی نیە .

## دەست نیشانکردنی بیرکۆڵی:

تیمی دەست نیشانەکردنی بیرکۆڵی لەم کەسە پسپۆریانەی خوارەوە پیکٚ دێت:

1-پزیشك :

بۆدەست نیشانکردنی تەندروستی وحاڵـەتی جەسـتەیی وکۆئەنـدامی دەمـاری مێشك وهەستەکان وهەموو ئەندامەندەکانی ئەومنداڵە وە.

2-پسپۆری دەروونی :

بۆدەست نیشانەکردنی زانینی ئاستی توانای ئـەقڵی ولێهـاتوی وهەڵچـونەکانی ئەومنداڵە.

3-توێژەری کۆمەڵایەتی :

هەل دەستی بە پێشکەش کردنی ڕاپۆرتێك لەسەرئەو ژینگەیـەی کەمنداڵەکـەی تیادا ئەژی وئاستی ڕۆشەنبیری خێزانی وئەو نەخۆشیانە کـە تووشـی دایکـی سـك پڕبوە .

4- پسپۆری منداڵی خاوەن پێداویستەکان:

بۆ دانانی پلانی خزمەت گوزاری پەروەدەیی کە ئەو منداڵە پێویستی پی هەیـە بەپێی ئەو زانیاریانە کە لە پسپۆرەکانی تر دەستی کەوتوە .

5-پسپۆری ڕاهێنانی کارکردن :

جاودێری ئەو منداڵانە ئەکات کە تەمەنیان ئەگاتـە چـواردە سـاڵ چـونکە ئـەو تەمەنە تەمەنی داهێنانە .

## ڕێنمایی بۆخۆپاراستنی منداڵان لە تووش بوون بەبیرکۆڵی:

خۆپاراستن لە تووش بونی منداڵان بە بیرکۆلی زۆر گرنگە لەبـەر ئـەوەی ڕێـژەی بیرکۆڵی ئەگاتە 2-3٪ لە دانیشتوانی جیهاندا،

هۆکاری بیرکۆڵی زۆرە وئاڵوزە وخۆپاراستنی گرانـە لەبـەر زۆری هۆکارەکـانی، چەند لـە جۆرەکـانی بیرکۆڵـان، باوکـان ئـەتوانن منداڵـەکانیان بپـارێزن ونەیـەڵن

ڕوویدات، لە ئەنجامی تویژەر ولێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە کـە ئـەتوانیٚ قەدەغــەی زۆر لە جۆرەکانی پەککەوتوی ئەقڵی بکرێت ویەکێك لەو تۆێژینەوەیە ڕایگەیانـدوە کەبە کارهێنانی کوتاندن هەمووسالێك (9000) حاڵەتی وەکو...هەوکردنی جگەر جۆری (B ) ...و کوتاندنی سورێژە،وهەزارەها نەخۆشی هەیە کە نـەیڵێن ڕوویـدات بە خۆپاراستن، هەرچەندە هەندێ جـۆر لـە بیرکـۆڵی ناتوانرێـت بەتـەواوی قەدەغــە بکرێت بەتایبەتی بۆماوەییەکان بەڵام ئەتوانرێت هێۆر بکرێتەوە .

## جۆرەکانی ئاستی خۆپاراستنی منداڵان لە بیرکۆڵی

ئاستی خۆپاراستن دابین ئەکرێت بە سەر سێ بەشدا :

**یەکەم : خۆپاراستنی دایکی دووگیان :**

تەندروستی وخۆپاراستنی دایکی دووگیان زۆر پێویســتە وبەتـەواوی کاریگـەری ئەکاتە سەر کۆرپەکەی، وپێویستە ئەو دایکە ئـەم ڕێنمایانـەی خـوارەوە جێبـەجیٚ بکات:

1. لە ژێر جاودێری پزیشکیدا بێت .
2. پارێزگاری تەندروستی خۆی بکات، وخۆراکی باش بخوات .
3. وازهێنان لە جگەرە و مەی و کحول وبەکارهێنانی دەرمان بـیٚ پرسـی پزیشك.
4. خوپاراستن لە منداڵبوونی پێش کاتی خۆی.
5. خۆپاراستن لە نەخۆشیە سێکسیەکان .
6. خۆپاراستن لە تیشکی سینی.
7. دورکەوتنەوەی دایکی دووگیان لە پشیلە ونابیٚ دەستی لێبدات .
8. کوتانی دایك دژی سورێژەی ئەڵمانی.
9. ئەبێت منداڵبوون لە نەخۆشخانەدا بێت .

**دووەم : پاراستنی منداڵ**

1. پشکنینی پزیشکی تەواوی بۆ بکرێت .
2. دابین کردنی خۆراکی باش و گونجاو .
3. کوتاندی مندالاّن لە کاتی خۆیدا .
4. پارێزگاری منداڵ لە...کەوتنەخوارەو...ڕووداوی ئوتوموبیل ..سوتاندن..خنکاندن ...هتد .
5. دور خستنەوەی منداڵ لە یاریکردن بە ئامرازە کارەباییەکانەوە .
6. دابین کردنی کەش وهەوایەکی دەروونی ..وپەروەردەی.. دارایی ..وکۆمەلاّیەتی. . و ڕۆشەنبیری بۆ ئەو مندالە .

**سێیەم : پاراستنی منداڵ لە کۆمەڵگا**

1. دور خستنەوەی مندالاّن لە مامەڵەی خراب وخستنەپشت گۆیی.
2. بەرنگاری کردنی هەژاری لە سەر منداڵ .
3. پشتگرتن خێزان و ڕوشەنبیرکردنەوەی .
4. پاك کردنەوی ژینگە لە پیسی وژەهر وەکو...دوکەڵی ڕەشی ئۆتۆمۆبێلەکان ...و فرێدانی شتی پیس لە کۆلان وشەقامەکاندا ...
5. پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری ڕێکخراوەکان .

**ڕێنمایی پەروەدەیی بۆ خێزانی منداڵە بیرکۆڵەکان**

زانا جۆردون(Jordon ) هەندێ پێشنیازی ئەکات کەچۆن یارمەتی خێزانی منداڵی بیرکۆل بدەین وەکو :

1. لەکاتی دایك بوونی ئەومنداڵە دایك وباوك زۆر پێوستیان هەیە کەخزمەتگوزاریان پێشکەش بکەن بەبێ ئەوەی خۆیان داوای بکەن بۆ ڕێکخستنی ژیانیان .

2. دایــك وبــاوكی ئەومندالآنــە پێویســتیان هەیــە بــۆ گفتوگــۆ كــردن لەگــەڵ ئەوخێزانانە كە مندالی وەكو ئەوانیان هەیە بۆئــەوەی هەســت بكــەن كــەوا خێزانی تر هەمان كێشەیان هەیە وە ئەوبارە قورسە كەوتوەتە سەر شانیان .
3. خێزانی ئەو مندالآنە پێویستیان بە كەسانی شــارەزای تایبــەت هەیــە كــەوا ئامادەبن بۆ یارمەتیان و ڕەفتارو ڕەوشتی ئەومندالــەیان بــۆ ڕوون بكەنــەوە وئەو چاوەڕوانیانەو پێشڕەویانە كە بۆیان دەكەن .
4. گەورەترین یارمەتی دایك وباوكی ئەو مندالآنە ئەوەیە كەوا ڕێز لە هەســتی ڕاتەكاندن وترس ودڵەڕاوكیان بگیرێت .

## ڕێنمایی گشتی بۆ خێزانی مندالآنی بیرکۆڵان

ڕێنمایی پەروەردەیی هەوڵدانێكە بۆ پــەروەدەكردنی ئەومنــدالآنــە پــەروەدەیێكی كۆمەلآیەتی ..و پەروەدەیی ...و خێزانی گونجاو بكرێن تاوەكو هەست بكــەن كــە ئەوانیش قبــوڵكراون لەكۆمــەڵگادا،دایك وبــاوك دەبێــت ئاگــاداری ئــەم خاڵآنــەی خوارەوەبن :

**یەكەم : نازپێدان**

دایك وباوك هەست دەكەن كە منــداڵێكی بیركۆڵیــان هەیــە ونــاتوانن ڕاهێنــان وپەروەدەی وەكــو منداڵــە ئاســاییەكان بكــەن، كەواتــە ئــەو منداڵــە دەبێتــەجێی بەزەییان، و هەموو شــتێكی بــۆ دابــین دەكــەن بــەبێ ئــەوەی هەوڵــدانی فێركــردن ڕاهێنانی بكــەن، لــیرەدا كێشــەیەكی زۆر گــەورەیان بــۆ خۆیــان و بۆمنداڵەكــەیان پەیدائەبێت.

**دووەم : سەرپێچی وپەسەندنەكردن**

ئەو خێزانە خاوەنی منــداڵی بیركــۆڵن ئاراســتەی نــەرێتیان هەیــە بەرامبەربــەو مندالآنە، سەرپێچی وپەسەندیان ناكەن وبێبەشــیان دەكــەن لەهــەموو مافــەكانی

ژیان وفەراموشی وپشت گۆیان ئەخەن، وچاودێری وسەرپەرشتیاریان ناکەن ومامەڵەی خراپیان لەگەلدا دەکەن وبەچاوی سووك سەیریان دەکەن.

**سێیەم : پشتگوێ خستن**

زۆربەی خێزانی منداڵی بیرکۆڵان منداڵەکانیان پشت گوێ ئەخەن وپێویستیەکانیان جێبەجێناکەن وەکو جۆری خواردن وپۆشاك وفێرکردن، وکاریگەریەکی زۆر خراب بو ئەو منداڵە دروست ئەکات .

**چوارەم : جیاوازی کردن**

هەندێ خێزانی بیرکۆڵان هەڵدەستن بە جیاوازی لەگەڵ منداڵە بیرکۆڵەکەیان ومنداڵەکانی تریان لە هەموو شتێکدا وەکو باسمان لەمەوپێش کرد .

**پێنجەم : سزای جەستەیی ودەروونی**

هەندێ خێزان هەڵ دەستن بە سزای ئەومنداڵە هەر کاتێك بێتە بەر چا ویان کە وا ئەزانن کە ئەمە جۆریکە لە نە هامەت ونەگبەتی تووشیان بوە .
.ئەمەش کاریگەریەکی زۆر ئەکاتە سەر دەروونی ئەو منداڵانە



# بەشی :حەوتەم

## پەککەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی

- پێناسەی پەککەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی
- هۆکاری پەککەوتووی جوڵانەوەو جەستەیی
- پاراستنی منداڵان لە پەککەوتنی جوڵانەوە و جەستەیی
- کاریگەری دەروونی لەسەر پەککەوتووی جولانەوە و جەستەیی.
- هۆکاری شلەژانی دەروونی لای پەککەوتووی جوڵانەوە و جەستەییەکان.
- کێشە دەروونیەکانی پەککەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی
- ڕێنمایی خێزانی بۆ خێزانی پەککەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی
- ڕۆڵی ڕێنماییکاری دەروونی بۆ قوتابی پەککەوتووی جوڵانەوە و جەستەیی

# بەشی حەوتەم

## پەککەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی : Physically disabled



### پەککەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی کێن؟

ئەو کەسانەئەگرێتەوە کە لاوازن وکەمو کورییان هەیە لە هەندێ ئەندامەکانی جەستەیاندا وەك شکاندن و بڕین یان تووشی نەخۆشیە بەردەوام بووەکان وەکو.. شێرپەنجە.... ونەخۆشیەکانی دڵ ....وئیفلیجی ..

ئەم جۆرە پەککەوتووە ناتوانێ ئەرکی جەستەیی وجوڵانی بە شێوەیەکی ئاسایی بباتە سەر، لەبەر ئەوە هەمیشە پێویستی هەیە بە چەند خزمەت گوزاری

ویارمەتیدانی لەلایەن کەسانیتر کە نـەتوانێ بـەبێ ئـەو یارمەتیـە پێویسـتیەکانی خۆی جێبەجێ بهێنێت، هەر وەها بەکار هێنانی چەند ئامێرێکی یەدەکە.

## هۆکاری پەککەوتووی جوڵانەوەو جەستەیی :

### 1- هۆکاری زگماکی :

وەکو : (تووش بـونی دایـك بـە ئاوڵـەی ئـەڵمانی ــ بـەکارهێنانی دەرمـان ـ نەخۆشیەکانی بۆماوەیی ...(لە بەشی چوارەمدا باسمان کردوە).

### 2- هۆکار ی وەرگێراو ژینگەیی :

أ- زاماری مێشك ـ (هەوکردنی مێشك (السحایا) Meningitis

ب- روداوی ئۆتۆمۆبیل ـ کەوتنەخوارەوە .

ج- زامـاری بڕبـڕەی پشـت کـار دەکاتـە سـەر توانـای تـاك لـە جوڵـەو گواستنەوە، وزۆربەی ئەم کێشەیە کاریگەری ئەخاتە سەر دەست وقاچ.

د- زاماری ماسولکەکان .

ه- ئیفلیجی.



و- ئێسك نەرمی Ricket

ز- نەخۆشیەکانی ڕۆماتیزمی منداڵان Rheumatism

ح- زۆربەی نەخۆشیە سەخت و گرانەکان کەوا تووشی منداڵان ئەبن وەئەونەخۆشیانە کە پێویستیان بە چاودێری تەندروستی بەردەوام هەیە

وەکو:

نەخۆشی..دڵ..تەنگەنەفەسی..هیمۆفیلیا...تالەسیمیا..شەکرە..لەرزوتا..

(ئەوبەشانەی لە پێشودا باسمان کردوە ).

## پاراستنی منداڵان لە پەککەوتووی جوڵانەوە و جەستەیی :

خێزانەکان پێویستە هەوڵ بدەن کە منداڵەکانیان بپارێزن لە پەککەوتنی جولاٌنەوە و جەستەیی بەم شێوەیە :

1- ئیفلیجی منداڵان

نەخۆشیەکە کە تووشی منداڵانی ساوا دەبێت،وە زۆر بەئاسایی دایك و باوك ئەتوانن زاڵ ببن بە سەر ئەو کارەساتەیەدا کە بەسەر منداڵاکانیاندا دێت زۆر بەئاساییە، ئەویش بە هۆی کوتاندن دژی ئەو نەخۆشیە،کەبریتیە لە دڵۆپی دەرمان ئەیدەن بە منداڵ لە دوای تەمەنی سێ مانگدا .

ئەوەی جێ دڵخۆشکەرە کە لەم ساڵانەی دواییدا هیچ حاڵەتێك لە کوردستاندا تۆمار نەکراوە.

2-لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی زانیارێە بنەرەتێەکان دەربارەی پاکو خاوێنی خۆراك،چاودێری کردنی منداڵ.

3-ڕێکخستنی وجێبەجێکردنی بەرنامەی چاودێری تەندروستی لەرێگەی کەناڵە تەلەفزیۆنەکانەوە وگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا .



4-ڕووداوی ئۆتۆمۆبیل :

یەکێکە لە هۆ سەرەکیەکانی پەککەوتن، وئەتوانرێت ئەم ڕوداوانەش کەم بکرێتەوە بە هوشیاری کردنەوەی هاتووچۆ،بەکارهینانی پشتۆنیی سەلامەتی، و بەکارهینانی کورسی منداڵ لە ناو ئۆتۆمۆبیلدا ..... .

5-ئیفلیجی مێشك :Cerebral Palsy

کەم کردنەوەی ئەم نەخۆشیە لەڕێی جاودێری کردنی ژنی سك پڕ لە لایەن پسپۆری تایبەت .

**کاریگەری دەروونی لەسەر پەککەوتووانی جوڵاەوە وجەستەیی :**

ئاشکرایە لای هەموان کە باری دەروونی لای هەموو خاوەن پێداویستەکان کە بارێکی دەروونی زۆر گرانیان هەیە کاریگەرێکی زۆر قورس ئەخاتە سەریان کە کەمتر نیە لە بارودۆخەکەی خۆیان، و دەرئەنجامی ئەمەش توشی: دڵەراوکی... و نائارامی... وهەڵچوون... خەمۆکی ئەبن، چونکە لە زۆرشت بێ بەشن وەکو... رۆیشتن... یاری کردن... جولانەوە (لە ترسی کەوتن) ... رۆیشتن بۆحەمام بەتەنیا... جلگۆڕین...

هەموو لەو هۆیانە شڵەژانێکی دەروونی لە دوایە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو شڵەژانە قووڵ ئەبنەوە وبەرەو زیادبونەوە ئەچن وبە پەرەسەندی تەمەن و بەرەو رووی نەخۆشیە دەروونیەکان ئەبنەوە وتەندروستیان بەرەو داڕمان ئەچێت، وهەرچە ندە

ئەو كێشەی ناجوڵاندنیش هەیە لێرداتووشی گەورە ترین كێشەی كۆمەڵایەتی دەبێت ئەویش پشت بەستن بە خەلكانی ترەوە، وئەمەش دەبێتە هۆی تەنگەرانی و نارەحەتی و هەست كردن بە كەمی و، بە وێنەیەكی نێگەتیڤ سەیری خۆی ئەكات، وەهەمیشە هەست بە دڵەراكی وخەمۆكی ئەكات، وە ئەو شلە ژانیانە وردەوردە كۆ ئەبنەوە، وە ئەو كۆبونانە لەناو كردارەكانی لاشعوردا پەرچ دەبێتەوە دەبێتە هوی ڕەفتاری شەرخوازی وگۆشە گیری وەلێرەدا گەورە ترین مەترسی پەیدا دەبێت بۆ ئەو كەسە ئەویش ناگونجاندنە لەگەڵ گرفتی جستەیدا، وەچڕی ئەو كاریگەریە ئەكەوێتە سەر... جۆری پەككەوتنەكە ... وە تەمەنی ئەو كەسە ... جگە لە بارودۆخی خێزانی وكۆمەڵایەتی كە ئەو پەككەوتووەی تیادا ئەژی، لیرەدا خێزان ڕۆلیكی زۆر گرنگ ئەبینیَ بۆ كەمكردنەوەی ئازاری كەسی پەككەوتوو ئەگەر هاتو پشتگیری و پەسەند كردنی ئەو پەككەوتووەی كرد، یان ئەبیتە سەرجاوەیەكی ئازاركێشانی وتەنگەرانی ونائارامی بۆی .

هەروەها كۆمەلگا زۆر بیَ بەزەییە بیَ ڕەحمی سەیری ئەم چینە كەوا ناوی برینداری بە سەریاندا سەپانۆە ووشەی(پەككەوتو )، وە بە هۆی دانانی سنور بۆ كەسانی پەككەوتوو، یان بە هۆی جیاوازی مامەڵە كردنی لەگەڵیاندا، لەبەر ئەوەی ئەو كێشانەی كەوا پەككەوتوەكان پێیەوە دەناڵینن تەنها بەهۆی پەككەوتنیانەوە نیە زۆربەی ئەگەرێتەوە بۆ ئەو كۆسپ و سەرنجانەی كەوا كۆمەڵگا پیَ بەخشیون.

## هۆكاری شڵەژانی دەروونی لای پەككەوتووی جوڵانەوە وجەستیەكان

### یەكەم :ئەو هۆكارانەی كە دەبێتە وەڵام دانەوەی دەروونی لای پەككەوتو:

1- تەمەنی ڕوداوی پەككەوتن :

هەندیَ پەككەوتوو هەیە هەر بە زكماكی تووش بوون، هەندێكی تریان بەمنداڵی تووش بوون، یان بە گەورەیی پەكیان كەوتوە وجیاوازی هەیە لە كەسیك بۆ كەسێكی ترەوە.

2-ڕەگەز :

ڕەگەزی پەککەوتوو کاریگەری هەیە بۆ شڵە ژانی دەروونی، نەبونی دەست یان قاچ یان هەرجۆرێکیتر لای مێینەکان کاریگەری زیاترە تاکو لای نێرینەکانەوە.

3-زیرەکی :

ئەو پەککەوتوانەی کە ڕێژەی زیرەکیان کەمترە زیاتر پشت ئەبەستێن بەکەسانی ترەوە، وزۆر خەفەت و بارو وەستی هەڵ چوونیان زۆرە .

4-تایبەتمەندی کەسایەتی :

کەسایەتی پەککەوتوو لە پێش ڕووداوی کەم ئەندامیەکەیدا کاریگەری هەیە لە سەر بەرواری حاڵەتەکەی .

5-خێزان :

خێزان ڕۆلێکی زۆر گرنگ ئەبینێ ئەگەر هاتوخیزانێ پەککەوتوو پەیوەندیان لەناو یەکتریدا بەیەکەوە هەبێت ئەوا خۆشەویستی وپشت کیری لێ دەکەن کەوا توشی ئەوحاڵەتەبوە، وئەمەش دەبێتە مایەی پەسەند کردنی وڕێزلێنان .

6-جۆری پەککەوتن :

کاری گەری دەروونی لە سەر پککەوتو جیاوازی هە یە لەسەر جۆری پەککەوتنەکە.

7-قەبارەی کۆئەندامی دەماری

ئەگەر هاتوو پەککەوتنەکەی بگەڕێتەوە بۆ کۆئەندامی دەماری بێگومان کاریگەری دەروونی نابێت تەنیا لەسەر کەسایەتی ئەوکەسە بەڵکو لە سەر چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ پەککەوتنەکەیدا، وئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکاریە دەروونیانەی کە کۆئەندامی دەماری دایناوە .

**گۆڕانکاریە دەروونیەکان**

1. شڵەژانی یاردەوەری
2. تێکچونی زیرەکی

3. گۆڕانكاریەكانی هەڵچوون نوەكو (دڵەراوكی – خەمۆكی )
4. گۆڕانكاریەكانی ڕەوشت

**دووەم :كێشە دەروونیەكانی پەككەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی**

1-هەست كردن بەماندوبوون:

پەككەوتوی جوڵانەوە دەبێت هەوڵ و ماندوو بونێكی زۆر بدات هەتاكو قەرەبوونی ئەو ناتەواوییە بكات، لەبەر ئەوە هەمیشە هەست بە ماندوبون دەكات.

2-گۆڕانی شێوەی جەستەیی :

ئەو كەمی وكورپیە دەبێتە هۆی گۆڕانكاری لە جەستەی پەككەوتوو كە ناتوانێت بیشارێتەوە، یان بەكار هێنانی چەند ئامێرێكی یەدەكە كەزۆر لەم ئامێرانە شێوەی جەستەیی ئەو كەسە ئەگۆڕێت و تێك ئەدات، و ئەمەش یەكێكە لەهۆی ئازاری دەروونی تیژ.

3-كاریگەری دەروونی بەهۆی ئەو ڕوداوەی كە پەكی خستوە، وئەمەش كاریگەری دەروونی كردوەتە سەر چەند هۆیەك وەكو :

ا-ئەزمونی ئەوكەسە.

ب- قەبارەی ترس كە تووشی ئەبیێت لە سەرەتای ئەو ڕوداوە.

ت-مامەڵكردنی خێزانەكەی.

پ -ئاواتەخوازی بۆ ئەوەی پشت ببەستی بەخۆی بۆ پەیداكردنی پێویستیەكانی ژیانی.

ت-هەست نەكردن بە ئاسایش.

ج-هەست كردن بە ترس وغەم وخەمۆكی بە هەستكردنی كە ئەو كەسانەی كە یارمەتی ئەدەن بەجی بهێڵن یان وازی لێ بهێنن .

4-كاریگەریەكانی خەڵك لەسەر پەككەوتوو

5-كاریگەری ئامێرە هاوكێشەكان وەكو:

أ- كێشەی بەكارهێنانی ئامێر

ب- کەم بوونەوەی توانای جولاَندنی ماسولکەکان

ت- شلە ژانی شێوەی گشتی پەککەوتوو شلۆشوقی ئامێرەکان

6-کاریگەری دەروونی بەهۆی گۆڕانکاری لە بارودۆخی کۆمەلاَیەتی وکارو ئابوری وەکو:

1. بزربونی ئاست ودۆخی کۆمەلاَیەتی

2. درێژ خایەنی چارەسەرکردنی کاریگەری ئەخاتە سەر خێزانەکەی کەدەبێتە هۆی بێزاربونیان.

3. بزربوونی پیشەو کاری ئەوکەسە بەهۆی ئەو حاڵەتەی کەوا توشی بوە وهەست کردن بە کاتی بەتاڵ، و نازانێ چۆن قۆستنەوەی بکات .

4. دروست بوونی ناکوکی لەگەڵ خێزانەکەیدا ئەگەر هاتو ئەوکەسە خێزان داربێت بەهۆی دورکەوتنەوە لەماڵەوە وەدەرچوونی بۆ چارەسەر کردن .

## ڕێنمایی خێزانی بۆ خێزانی خاوەن پەککەوتووی جەستەیی جوڵانەوەکان

ڕێنمایی خێزانی بریتیە لە خزمەتگوزاری وپشتگیرکردن لەو خێزانانەی کەخاوەن منداڵی پەککەوتون، و فشارێکی زۆریان ئەکەوێتە سەر. لێرەدا پێویستی زیاتریان دەبێت بە یارمەتی ڕێنمایی خێزانی، و ئەو ڕێنمایی کارە یەکەم جار هەول ئەدات کە چۆن چارەسەری ئاسودەییەی بۆ ئەو هەواڵە ناکاوە کە لەکاتی لەدایکبونی ئەو منداڵە پێیان دەڵێن بدۆزێتەوە، و ئەو ڕێنمایانەش پێك دێت لەم خاڵانەی خوارەوە :

1- یارمەتی خێزان بۆ قبول کردنی ئەو منداڵە پەککەوتووە.

2- کارمایی هەموو ئەندامی ئەوخێزانە بۆ مامەڵە کردن بەشێوەیەك پەروەدەیی گونجاو .

3- ڕێنمایی ئەو خێزانە بۆ ئەوەی منداڵەکەیان بپارێزن لە شتی مەترسیدار .

4- دابین كردنی هەموو ئەو ئامێرەیارمەتی دەرانەی كە پێوستە بۆ جوڵانەوەیان



5- دەوڵەمەند كردنی ژینگەی ئەو منداڵە بۆ پەرەپێدانی هەمو تواناكانی .

6- دابین كردنی یەدەكی ڕابواردن وبردنی جاروبار بۆ باخچە وشوینە گشتیەكان.

7- فێر كردنی خێزانكەی كەچۆن چارەسەركردنی ئەو جۆرە كێشانە بكات كەوا تووشی ئەبێ وەكو كێشە دەروونی وكۆمەڵایەتی و ئابوری.

## فێركردنی منداڵانی پەككەوتووی جوڵانەوەوجەستەیی

Teaching students with physical disabilities

### یەكەم : بەشی ناوخۆیەكانی پەككەوتووان:

ئەو بەشە ناوخۆیانە تایبەتە بۆ ئەو پەككەوتوانە كە هەمو پێویستێیەكانیات وخزمەت گوزاریێ... پزیشكی... و پەروەردەیی... ودەروونی ...كارایيان بۆ دابین كراوە، كە هەمو كاتێكیان تیا ئەبەنە سەر، و ئەو بەشە ناوخۆیانە ئەبنە هۆی دورخستنەوەی ئەو پەككەتوانە لە خێزانەكانیان ولە كۆمەلگاكەیان .

**دووەم : ناوەندەکانی پەککەوتوان:**

لێرەدا ئەو پەککەوتوانە لەبەیانی هەتاکو کۆتایی بەردەوام لە ناو ئەو ناوەندە ئەمێننە وە، ودوای دەوام ئەگەڕێنەوە بۆ ناو خێزان و کەسوکاریان، وجیاوازی ئەم جۆرە قوتابخانەیە لەگەڵ قوتابخانەکەی تر ئەوەیە ماوەیەکیان بۆ ئەمێنێتەوە کەوا لەگەڵ خێزانەکانیان ئاوێتەبن .

**سێەم : تێکەڵکردنی ( الدمج ) پەروەردەی :**

وارەچاو ئەکرێت کە تێکەڵاو بوونی قوتابیە پەککەوتوەکان لەگەڵ قوتابییە ئاسایەکان لە یەك قوتابخانەدا باشترین ڕێگەیە بۆ ئەوەی لەباری دەروونیەوە هەست بە کەم وکوڕی نەکەن .



ئاسانکردنی پرۆسەی تێکەڵکردن ( الدمج ) یان دووبارە تێکەڵکردنی لەو کۆمەڵگایەی لێ دەژیت ، وبەشێوەیەکی زیندوو بە ئامادەکردنی کۆمەڵایەتی دا دەنرێت لە هەموو کرداری ئامادەکردنیدا وەکو : ( تەندروستی – فێرکردن – پیشەیی ) ، هەروها ئاماژە دەکات بە ئەزموون و توانای پەککەوتوەکە بۆ سەرکەوتن بەسەر هەموو ئەو کێشە دەروونییانەی کەوا توشی ئەبێت .

### ئامانجەکانی تێکەڵ کردنی منداڵان

1-کەم کردنەوەی جیاوازی کۆمەڵایەتی ودەروونی لە ناو منداڵەکاندا .

2-ئەو منداڵانە هەست بەپەسەند کردنی خودی خۆیان دەکەن وهاندەرەکانیان زۆرئەبێت بۆ فێربون .

3-رزگارکردنی ئەو منداڵانە وخێزانەکانیان لەو لەك وپەڵەیەی کە سەپێنراوەبە سەریاندا بەهۆی رۆیشتنیان بۆ قوتابخانەی تایبەتەندیەکان.

4- توانای زمانەوانی ئەومنداڵانە بەهۆی تێکەڵ بونیان لەو قوتابخانە ئاسایانە زۆر باش ئەبێ.



### رێنمایی کردنی منداڵی پەککەوتووی جوڵانەوە وجەستەیی

1- یارمەتی ئەو منداڵە بۆ هەست کردن بەهەبونی لە ژیاندا و رێز وبایەخ پێدان لەخودی خۆی .

2- پیشاندانی ئەزموونێکی خۆشی بۆئەو منداڵە لەژیاندا.

3- هێورکردنی شلەژانی وتورەیی لای ئەومنداڵە.

4- یارمەتیدانی بۆ ڕزگار بوونی لە کێشەی پیَ نەگەیشتن و بیَ ئاسایش.
5- ڕزگار کردنی لە هەست کردن بە ناتەواوی خۆ ی بەکەمی ناتەواوی زانین.
6- ڕاهێنانی لەسەر لێوەشاوی بڕیاردان و چارەسەری کێشەکان .
7- ڕێنمایی کردنی کە چۆن خۆی بپارێزێت لەشتە سامناکەکان وەکو : یاری کردن بە ئامێری کاربا.. و تەباغ.. و غاز، و فێرکردنی کە چۆن بەشێوەیەکی ڕاست لە شەقام وکۆڵانەکان بپەڕێتەوە .
8- ڕێنمایی کردنی کە چۆن خۆی بپارێزیَ لە درم و نەخۆشیە پەتاکان.
9- فێرکردنی دابی نان خواردن ولەبەرکردنی پۆشاك بەشێوەیەکی ڕاست.
10- ڕێنمایی کردنی بۆ هاتووچۆ کردنی ئەو سەنتەر ونەخۆشخانانە کەوا پێویستی پێان هەیە و خزمەتی دەکەن .
11- فێرکردنی بە هەموو ماف وئەرك وپاپەندبون بە یاسا.
12- فێر کردنی چۆن باوەڕی بە خودی خۆی بێت و واز لە شەرانگێزی بهێنێت هەوڵدان بۆ پەرەپێدانی و سوود وەرگرتن لە تواناکانی .

**ڕۆڵی ڕێنماییکاری دەروونی بۆ قوتابی پەککەوتوی جوڵانەوە و جەستەیی:**

1)هەوڵ دانی ڕێنماییکار بۆ پێشکەش کردنی یارمەتی بۆ پەککەوتوان لە نێو کۆمەڵەکە یان لە چاودێری کردنیان لە دەزگا جیاجیاکاندا .
2)لابردنی جیاوازی و زەنگی کۆمەڵایەتی دژ بە پەککەوتووان .
3)لابردنی ئەو بەربەستانەی کە دەبنە ڕێگر لەبەردەم پەککەوتوان بۆ تێکەڵ بوون و بەشدار بوون لە کارەکانی کۆمەڵگا .
4)کارکردن بۆ ڕێگرتن لە پەککەتوویی لە ڕێگای ڕاگرتنی هۆکارەکانی .
5)دان پێنان بە پەککەوتووان وەك ڕێزگرتنیان و دانپێدانانی مافەکانیان.
6)کەم کردنەوەی گرژی وتوڕیی و ئاگادارکردنەوەی ڕای گشتی بەکێشەکانی پککەوتوو وهاندان بۆیارمەتی دان وقبوڵ کردنیان .
7)یامەتی بۆ ڕزگاربونی لە کێشەی پێنە گەیشتن و نائاسایشی.

.1



8)یارمەتی بۆ ڕزگارربونی لە هەستی کەم وکۆری.

9)ڕاهێنانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی وەخۆ ڕاگرتن وبڕیار دان.

10) ڕێنمایی کردنی بۆ خۆپاراستن وئاسوودەیی لە یاری کردن بە ئامرازی کارەبا وگاز و چۆنیەتی پەڕینەوە لە شەقامدا.

11) ئامۆژگاری چۆنیەتی مامەڵە کردنی لەگەڵ دایك و باوکی و مامۆستاکانی و برادەرەکانی.

12) فێرکردنی بۆ هاتوچۆی نەخوشخانەو ناوەندە تایبەتەندییەکان و پشتگرتن بەخوودی خۆی.

13) یارمەتی بۆ کەم کردنەوەی توڕەیە وئائارامی ،

14) فێرکردنی چۆن گفتوگۆ لەگەل کەسو کاری بکات لە کاتێك کە ئیشیان پیێ دەبێت.

15) هاندانی بۆ بەکارهێنانی هەموو جۆرە تواناکانی.

16) فێرکردنی لە بەر کردنی هەمووجۆرە جلو بەرگێك .

17) ڕاهێنانی ئەو یاریە کە هاوتا بێت لەگەڵ توانای جەستەیدا .

## بەشی :هەشتەم

## پەککەوتووی نەبینین

پوختەیەکی مێژووی دەربارەی بایەخ پێدان بە قۆناغەکانی پەرەپێدانی پەککەوتووی نەبینین

پێناسەی پەککەوتووی نەبینین

جۆرەکانی: پەککەوتووی نەبینین

پۆلینکردنی پەککەوتووی نەبینین

هۆکاری پەککەوتنی نەبینین

تایبەتمەندیەکانی منداڵانی پەککەوتوی نەبینین

هەستەکانی نەبینان

کێشەکانی پەککەوتووی نەبینین

جۆرەکانی بەرنامەی پەروەردەیی بۆ قوتابیانی نەبینان

ئامانجەکانی ڕێنمایی دەروونی بۆ نەبینان

ڕێنمایی پەککەوتوی نەبینین

# بەشی : هەشتەم

## نەبینان : پەككەوتوى چاو Blind



**نەبینان (كوێر ) :Blind**

### پوختەیەكی مێژووی دەربارەی بایەخ دان بە قۆناغەكانی پەرەپێدانی پەككەوتوی نەبینین :

### قۆناغەكانی مێژوی پەرەپێدانی پەككەوتوی نابینین

یەكەم :چەرخی كۆن : OLD - AGES

لەم قۆناغەدا نەبینان هیچ جۆرە بایەخ پێدانێكی پەروەردەیان نەبوە، و ژیانێكی هەژاری وداماویان كێشاوە، زۆر لەو باوكانە كە منداڵی كوێریان هەبوە هەڵ نەستان بە سواڵ كردن پیانەوە بۆ ئەوەی خەڵك خێریان پێ بكات، و ڕای ئیفلاتۆن

.. وئەرستۆ ...وابو کە پێویستە ئەو نەبینانە بیان فەوتێنن ئایا بەکوشتن یـان دورە وولآتیان بکەن، وەئەمەش لە یاسای the laws of Le krojus and Solon بوو.



ولە ڕۆما هەتاکوماوەیەکی زۆر هەرلەسەر ئەو یاسایە مانەوە کەوا پەککەوتوی نەبینیانیان فڕیان ئەدانە ڕوباری تایپر(Tiper ) لەئیتالیا بۆ ئەوەی بخنکێن، بـەڵام بەهاتنی (ڕۆمۆس) کەداوای دامەرزاندنی سەنتەرێکان بۆ بکەنەوە لەبەر ئەوە بۆیان دەرکەوی کەوا پەککەوتووی نەبینان هاوولاتی چاکن یان نا .

وئەم کوشـتن و لـەناوبردنی نـەبینان ئەگەڕێتـەوە بـۆ بـیرو بـاوەڕی ئەفسـانە و خورافاتی ئەو سەردەمە، و باوڕیان وابو هەر کەسیّ دەست بدات بەدەستی کوێرەوە ئەوا ئەویش کوێر دەبێت، چونکە لەوباوەرەدا بوون کە وا دەسەکانیان مەترسی دارن لەسەر تەندروستی گشتی و، لەبەر ئەوە هـیچ جـۆرە ئـیش و کارێکیـان پیـا ڕانـە ئەسپاردن.

هەر وەها هەندیّ کومـەڵگا باوەڕیـان وابـو کـە نـەبینان نـەفرەتی خواکەیانـە لەبەرئـەوە زۆر ڕسـوا ئـەکران بەچـاوێکی سـووك تەماشـا ئـەکران وزۆر جـاریش ئەکوژران، وهەندیّ کەسانی تر وایان ڕەچاو ئەکرد کـە نـەبینان مشـەخۆرن لەسـەر کۆمەڵگا ئەبنە هۆی بێهێزی کەم کردنەوەی ئازوخە، و هەرئەبێت بە زووترین کـات لەناویان بەرن بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکەیان بیّ هێز نەبێت. (عبدالعزیز:2008)

**دووەم :چەرخی- ناوەراست MIDDLE-AGES**

لەساڵی 1601 لە ئینگلستان شاژن (ئیلیزابیل ) یاسایەکی دەرکرد بۆیارمەتی هەژاران، وەپەککەوتوی نەبینانیشی بەر کەوت چونکە ئەوانیش لە چینی هەژاران بوون، وە شا لویس لە فەرەنسا حەشارگایەکی بۆ دروست کردن کە جیێ(300) نەبینانی تیا ئەبووەوە، وەچەند خزمەت گوزاریکیان پیشکەش ئەکرا بۆ ئەوەی مەعنەویاتیان بەرزبیتەوە .هەر لەو کاتەدا (فالنتین هۆی) لە پاریس چاوی کەوت بە نەبینانێك کەسواڵی ئەکرد لەناو شەقامێکدا، لەپاش گفتوگۆکردن هێنایە ماڵی خۆی وە زۆر گرنگی پێدا وە قوتابخانەیەکی بەناوی ئەوەوە دامەزراند وە زۆر بەزوویی ژمارەی قوتابیەکان گەیشتنە (12)، فالنتین هەستا بە دانانی چەند پیتێکی زۆر گەورەو دەرپەریو هەرکاتێك پەنجەی نەبینانی بەریکەوێت ئەتوانێت بیخوێنیتەوە، دوابەدوای ئەوە چەند قوتابخانەیەك تر کرایەوە بۆ نەبینان لە شارە گەورەکان وەکو:... لیڤەرپوڵ... ئەدنبەرە... بریستۆل... لەندەن... وەلەزۆر پایتەختەکانی جیهان.



هەروەها گەشەی پەرەپیدانی پەروەردەی نەبینان بەشێوەیەکی زۆر دەستی پیێ کرد لە دوای وتارەکانی (ڤۆلتێر) کە دەری خست پەککەوتوی نەبینان ئەتوانیێ پشت بەخۆیەوە ببەستێت گەر هاتوو دەرفەتی ڕاهێنانی کاری بدرێتیێ .

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا فێرکردنی نەبینان کرا بە فەرمان، وە ڕیگای (لویس برایل:- Braille Method) لەگەل ڕیگای (مون :Mon -Method) کەوتنە بەر چاوەوە وەئەوانەش دوو ڕێگای وانەوتنەوەن بۆ نوسینی دەرپەڕیو بۆ نەبینانە (ملحم2001).

**سێیەم : سەدەی بیستەم هەتاکو ئێستا NOW &TWENTIETH CENTURY**

هەر لەگەڵ سەرەتای ئەو سەردەمە دا هاواری مامۆستایان وفێرکەران لە حکومەتەکانیان داوایان ئەکرد کە گرنگ بدەن بە پەککەوتوی نەبینان، وئەمەش بو بە هۆکاری دەرچونی یاسایەك سالیّ(1920) لە ئینگلستان بۆ نەبینان، کە بریتیبو لە چاك کردنی پلەی ژیانیان، دوابەدوا ئەو یاسایە چەند سەندیکاو کۆمەڵی خێرخواز داوای یارمەتیان بۆ ئەو نەبینانە ئەکرد، هەروەها کۆمەڵەی ئینگلیزی بۆ پەرەپێدانی نەبینان دامەزرا بۆ فێر کردنی هەندێ ئیشوکار، وئەمەش بو بە هۆی ئەوەوە کەوا قوتابخانەی سەرەتاییان بۆ کرایەوە و لەو کاتەوە هەتاکو ئێستا لە هەمو وڵاتەکانی جیهان گرنگیان پێ درا و هەموو لەو قوتابخانانە ئاسان کاریان بۆ کراوە

## پێناسەی پەککەوتووی چاو یان نەبینان

### 1- پێناسەی یاسایی بۆ نەبینان :

کەسی نەبینان بەپێی یاسا وبۆچوونی پزیشکەکان ...بەو کەسە ئەوتری کە تیژی بینینی چاوی لە ( 6\60) پێوەر (20\200) پلە پێ زیاتر نەبێ ئەگەر چی لەگەل بەکارهێنانی چاویلکەی پزیشکیدا، و ڕێژەیەکی کەم بەتەواوی توانای بینینیان نیە، بەڵام زۆربەیان چەند پلەیەك کەم بینینیان هەیە .

### 2-پێناسەی پەروەردەیی بۆ نەبینان:

بەو کەسە دەڵێن پەککەوتوو نەبینن کە دەناڵێنێ بەدەست هەستی نابینینی زۆر توندە و توانای خوێندن ونوسینی نیە تەنها بە ڕێگەی (برێل Braille-Method) نەبێت، بەڵام ئەوانەی ئاستەکەیان کەمە ئەتوانن بخوێننەوە وبنوسن بە چاویلکەی گەورەکەر .

**جۆرەكانی: پەككەوتوی نەبینان :**

**یەكەم : پەككەوتووی نەبینینی زۆر توند :total blindness ).**

ئەو جۆرە پەككەوتوانانە بەتەواوی هەستی بینینیان نەماوە ورێژەیان ئەگاتە كەمتر لە 20\200پلە، ناتوانن كەڵك لە ئەزمونی پرۆگرامەكانی پەروەردە وفێربون بكەن ... وەكو كەسانی ئاسایی وەربگرن ...و پێناسەی یاسایی وپەروەردەی بەسەریاندا ئەگونجێت .

**دووەم : پەككەوتوی نەبینینی توند :**

ئەم جۆرە نەبینانە ئەتوانێت چارەسەر بكرێت لە ئەنجامی یارمەتیدەرەكانی بینین .

**سێیەم: پەككەوتوی نەبینانی بەشی (جزئی) یان كەم بینین Low Vision**

ئەم جۆرە پەككەوتوانە بەشێك لە هەستی بینینیان لەدەست داوە، و توانای خوێندن ونوسینیان هەیە... بە یەدەكی گەورە كردن یان... جاویلكە تایبەتمەندی ...ریگەی برێل، وهۆی ئەم جۆرە نەبینیانە كەمی لە گەشەی دەماری بینینە .

**چوارەم : كێشەی نە بینراوە هەمەجۆرەكان : other visual problem**

**پۆلینكردنی پەككەوتووی بینین :-**

**1. نەبیانی دەر ئەنجامی ڕودا و :**

زۆر جار سەری مرۆڤ تووشی ڕوداوێك دەبێت كاریگەری زۆر ئەخات سەر ناوەندی دەماری بینین و تۆری جاو لە مێشكدا، یان هەندێ جار تۆری چاو تووشی خوێن بەربوون دەبێت بە هۆی فشاری خوێن یان بەركەوتنی كیمیائی یاخود لە ئەنجامی بەركەوتنی چاو بە هەندێ شتی تیژ .

**2- نەبینینی ڕەنگ ، کوێری ڕەنگ :( عمى الالوان DALTONISM )**

هەندێ کەس هەیە توانای جیاوازی ڕەنگەکانیان نیە وەکو کەسە ئاساییەکان، زۆر جار ئەم نەخۆشیە بۆماوەییە، بەڵاّم زۆر جار بە هۆی کەم و کوڕی چاو یان دەماری بینین ومێشك یان بەکار هێنانی مەوادی کیمیاویەوە ڕوئەدا، زانای کیمیاوی ئینگلیزی (جۆن دالتۆن ) تویژینەوەیەکی بلاو کردەوە لەسەر ڕەنگ نەبیبین کە خۆیشی ئەو نەخۆشیەی هەبوو . وزۆربەی ئەو کەسانە توانای هەستیان نیە لەسەر چەند ڕەنگێك بە تایبەت ... سەوز ....وسور .

**3- شەو کۆیری :(العمى او العشى الليلىNIGHT BLINDNES S )**

ئەوانەی بەم جۆرە نەخۆشیەوە ئەناڵێنن توانای بینینیان نیە لە کاتی لێڵ وتاریکیدا، یان لە کاتی گۆڕینی شۆێنەکەیانەوە لە ڕۆشناوە بۆ شۆێنێکی تاریك .

**4- نەبینانی دەروونی (سێکۆلۆژی PSYCHOSOCIAL DNESBLIN**

نەبینانی دەروونی لە پڕ ڕوو ئەدا لە دوای ڕاتەکانێکی هەستیاریەوە کە ئەو کەسەی تووشی دەبێت ناتوانێت بەرگەی ئەو بینینە بگرێت و تووشی هستیریا(Hysteria) دەبێت، هیستریا نەخۆشیەکی دەروونیە دەبێتە هۆی شلۆقی دەمار وجولاّنەوەکان گاریگەری ئەکاتە سەر ئەندامەکانی جەستە وچاویش یەکێکە لەو ئەندامانە کە ئەبیێتە هۆی نەبینین، وەکو دایکێك کە کوڕەکەی لەبەر چاوی ئەمرێ تووشی ئەم حالّتە ئەبێ، هەر وەها هەندێ قوتابی بەدەست کەم بینینی چاویان ئەناڵێنن بۆ ئەوەی لە قوتابخانە هەلبێن بەلام کە تاقیکرنەوەی پزیشکیان بۆ ئەکریت دەرئەکەوێ کە چاویان هیچ کەمو کۆڕییەکی نیە، وئەم جۆرە حالّەتانە دەبێت پزیشیك دەروونی چارە سەریان بکات .

**5- حاڵەتی کورت بینین : قصر النظر NEARSIGHTEDNESS**

کورت بینین ئەو حالّەتەیە کە ئەو کەسە تووشی دەبێت لە ئەنجامی گەورەی قەبارەی تۆپی چاو کە دەبیتە هۆکاری کۆبونەوەی تیشکی ڕوناکی یان وێنەی شتە

بینراوەكان ئەشكێتە ناو چاو پێش ئەوەی بگاتە تۆری چاو، وەدەبیتە هۆی هەستی گران بینینی شتی دوور و پێویستی بە چاویلكە هەیە بۆ بینینی شتە دورەكان، بەلاّم شتە نزیكەكان باش ئەبینن وەهیچ پێویستیان بە چاویلكە نیە .

6- حاڵەتی دور بینین : بعد النظر : HXPOROPAIL

ئەو كەسەی كە دور بینە ناتوانێ شتی نزیك بەباشی ببینێ، و دروست دەبێت لە دەر ئەنجامی بچوكی قەبارەی تۆپی چاو دەبێتە هۆی كۆبونەوەی تیشكی ڕووناكی یان كەوتنی وێنەی شتە بینراوەكان دوای تۆری چاو كە دەبێتە هۆی گران بینینی شتە نزیكەكان و پێویستی بە چاویلكە هەیە بۆ بینینی شتە نزیكەكان نەوەك دوور .

7- حاڵەتی بینراو گرانی( ئیستیگماتزم ASTIGMATISM ):

خاوەنی ئەم جۆرە حاڵەتە زۆر بە گرانی شتەكان ئەبینن وبە شێوەیكی گران Notion Focus وهۆكاری ئەگەرێتەوە بۆ ئەوەی بیلبیلەی چاو لە شوێنی ئاسایی خۆیدا نیە، و بە چاویلكەی تایبەت ئەتوانێ باش ببینێت .

- جلاكۆما Glaucoma :

جلاكۆما ناسراوە بە (ئاوی شین) وئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ زۆربونی ئەو ئاوەی كە لە بیلبیلە چاودا هەیە وەپاڵە پەستۆی چاو لەگەڵ ئەو پاڵە پەستۆیە لەوانەیە خۆین نەگاتە دەماری بینین ئەمەش دەبێتە هۆی نەبینین .

9- ئاوی سپی یان ئاوی مرواری :CATARACT

زۆربەی ئەم نەخۆشیە تووشی كەسانی بە ساڵاچواناندا دەبێت، زۆر جار عەدەسەی چاو تارادەیەك ڕوونی خۆی لە دەست ئەدات لە ئەنجامی بونی هەورێكی سپی یان زەرد لەسەر چاو وەكو پەردەیەك یەتە بەر چاو وبینراوەكان بە زەردی دێنە بەر چاو .وئەمەش دەبێتە هۆی لاواز بوونی هێزی چاو .

**10- چاو خێلی - الحول STRABISMUS :**



ئەمەش بریتیە لە ناهاوسەنگیەك لە نێوان دەمارەکانی چاو کە لەئەنجامدا هەردوو چاوەکان ناتوانن تەرکیز بکەنە سەر هەمان شێوە لە هەمان کاتدا ئەنجام بدەن هەریەك لە چاوەکان بە ئاڕاستەیەك دەڕوات جیاوازە لە ئاڕاستەی ئەوەی تر واتە سەر هەردوو ئاراستەکە لە یەك خاڵ یەکتر ناگرنە و ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی دووشت لە یەك کاتدا وە هۆکاری خێلی زکماکیە یان بۆ ماوەییە یان کەم بینینە لە چاوێکدا وەهەندێ جار لە کەمی ماسولکەکانی چاوەوەیە.

**11- نەخۆشی شەکرە (DIABETES )**

ئەمەش دەر ئامانجی نەخۆشی شەکرەیە کە ئەبێتە هۆی کەمی ڕێژەی پێویستی شەکر لە خانەکانی تۆری چاو وردەوردە دەبێتە هۆی نەبینین .

**12-نەخۆشی تراکۆما TRACHOMA**

تراکۆما نەخۆشیەکی درێژ خایانە تووشی بیلبیلەی چاو دەبێت، وئەم نەخۆشیە ئەگوازێتەوە لە کەسێك بۆ کەسێکی تر، و زۆر زوو بڵاو دەبێتەوە لە ڕێگەی بەکارهێنانی خاولی و جلوبەرگی نەخۆشەوە .(الخطیب،والحدیدي:1999)

## هۆکاری پەککەوتنی نەبینان

**یەکەم : هۆکاری پێش لە دایك بوون (زکماکی ) یان هۆکاری بۆ ماوەیی:**

ئەم هۆکارانە لە بەشەکانی پێشودا باس کراوە

1- هەندێ لە نەخۆشیەکان ئەگواسترێنەوە لە باوانیانەوە بۆ منداڵەکانیان لە ڕێگای کرۆسۆماتەکانەوە کە خەسڵەتی میراتی پێەوەیە وەکو لاوازی خانەکانی بینین یان دەمارگیری .

2- تووش بوونی دایکی سك پڕ بە هەندێ نەخۆشی ترسناك وەکو ئاوڵەی ئەڵمانی و نەخۆشی زوهری وکاری شۆکی .

3- ژەهراوی بوونی دایکی دوو گیان بەو دەرمانانەی کە ئەیخوات .

4- ئالودە بوونی دایکی دووگیان بە مەی ومادە هۆشبەرەکان .

5- تێك چوونی دەماری بینینی بۆ مێشك .

6- لە دایك بوونی پێشوەختەوە ناتەواو بوونی گەشەی کۆرپە

**دووەم- هۆکاری کاتی لە دایك بوون :**

1-سەختی لە دایك بوونی منداڵ دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی گازی ئۆکسجین لە سەر کۆرپەکە وە ئەمەش تووشی مردنی خانەکانی بینینی ئەکات ( سەیری بەشی چوارەم بکە ) .

**سێیەم هۆکاری دوای لە دایك بوون :**

وەکو زۆری ڕێژەی ئۆکسجین کەئەدری بە منـدالی نـا ئاسـایی ( اطفـال الخدج) وئەو ڕوداوانەی کە تووشی منداڵ ئەبی . ( سەیری بەشی چوارەم بکە )

**چوارەم :هۆکاری ژینگەیی**

1-تووش بوونی بەهەنـدێ نەخۆشـی ئەگـەر چارەسـەر نـەکرێ کاریگـەری زۆر ئەکاتە سەرچاو و دەبێتە هۆی نەبینین وەکو : نەخۆشی شەکرە ... تەراکۆما ... ئاوی ڕەش وسپی ..هتد .

2-پێکانی چاو بەشتێکی تیژ.

3- تووش بوونی مرۆڤ بە پێکان لە چاو ومێشـك لـە دەرئـەنجامی بەرکـەوتنی بەهێز یاخود کەوتنە خوارەوە لە شوێنی بەرز یان ڕووداوی هاتووچۆ .

4-کەمی هەندێ ڤیتامین وەکو ( A ).

5-لەرینەوەی گلێنەی چاو کەبریتیە لە ڕژێنێکی نارێکی خێرایـی لـە چـاو کـە دەبێتە کەم بوونەوەی توانای تەرکیز کردنی بینینی بینراوەکان بە شیوەیەکی نارێکی .

## تایبەتمەندییەکانی منداڵانی پەککەوتووی نەبینان :

دایك وباوك و مامۆسـتایان دەبـێ هەمیشـە چـاودێری منداڵـەکانیان بکـەن و تێبینینی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن :

**یەکەم : تایبەتمەندی ڕەوشتیەکان :**

1. منداڵی پەککەوتووی نەبینا هەمیشە پەرتوك و دەفتـەر ونوسـراوەکان زۆر نزیکی چاوی ئەکات .
2. هەمیشە چاوی ئەخورێنێ .
3. هەوڵ ئەدا کە هەمیشە چاوێکی بکاتەوە وئەو چاوەکەی تریان بنوقێنێ بەشێوەیەکی بەردەوام .
4. ئارەزوی خۆیندنەوەی نیە وهەر شتێکی تر پێویستی بە بـەکار هێنـانی چاوبێت

5. پەککەوتوی نەبینان ناتوانیٚ بەسەربەستی جولٚە بکات ئەمەش کـرداری پشت بەستنە بەوانی ترەوە .
6. هەمیشە تووشی کەوتن و خۆدان بەشتدا دەبێت .

**دووەم : تایبەتمەندی شێوەی فۆرمی چاو :**

1- خێل بوونی چاو .
2- ئاوسان و سوربوونی پێلوی چاو .
3- هەوکردنی چاو بە شێوەیەکی زۆر.
4- زیاد بوونی فرمێسکی چاو بەشێوەیەکی زۆر.
5- هەست کردن بە سوتانی چاو کەئەبێتە هۆی خوراندنی چاو .
6- تووشی سەر ئێشە وگێـژی ڕاسـتەوخۆ دەبێـت لـە دوای هـەر ئیشـێك کـە پێویستی بە بینینێکی نزیك هەبێت .
7- توانای بینینی شتی بە ڕونی نیە گەر هاتو لە ماوەیـەکی نزیکـدا بێـت، و شتەکان وەکو لەناو هەور وتەمدا بێت .

**چوارەم : تایبەمەندی هەڵچوونی :**

1. زوو تورە ئەبیٚ.
2. هەست بە گۆشەگیری ئەکات .
3. شەرانگێزە.
4. هەمیشە تووشی دەمارگیری دەبێت .
5. زۆربەی کات بەدەست دڵەڕاوکیەوە ئەناڵێنێت .
6. ناتوانێت پشت بەخۆیەوە ببەستێت .
7. ئاستی بەرزی نیە .
8. نائومێدی وبیٚ ئامانجە.
9. هەست بە نائاسایشی دەروونی ئەکات کە تووشی دوورە پەرێزی بێت .

**هەستەکانی نەبینان :**

کەسی پەککەوتو توانستی هەندێ لە هەستەکانی تر زیاتر دەبێ لە کەسە ئاسایەکان وەکو هەستی دەستلێدان ...وبیستن ....وبۆن کردن ...وتام کردن، وبنەمای ئەم توانیستەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕاهێنانی ئەم هەستانە لە لای پەککەوتوو زیاتر دەکات، ئەو هەستانە ئەمانەن :-

**1- هەستی بیستن :**



هەستی بیستن لای تاکی پەککەوتوی نەبینان گرنگیەکی زۆری هەیە، ئەو هەستەی زۆر بەهێزە و ئەتوانێ جیاوازی هەموو جۆرە دەنگەکان بکات، وە لە ژیانیدا زۆر پشتی پێوەئەبەستێ، وەهەندێ نەخۆشی کاریگەری ئەکاتە سەر بیستن وەکو ...ئاوڵەی ئەڵمانی ....وهەوکردنی مێشک ....وملە خڕە...وهۆکاری بۆماوەیی ....وکێشەکانی کاتی لەدایك بوون ...و بەکارهێنانی ئەو جۆرە دەرمانانەی کەئەبێتە هۆی تێکدانی هەستی بیستن .

**2- هەستی دەستلێدان (هەستی گرتن -اللمس TOUCH)**



گرنگی ئەم هەستەلای تاکی نەبینان بە پلەی دووەم دێت پاش هەستی بیستن، و تاکی نەبینان بە کاری ئەهێنێت بۆچەند ئەرکێك ومەبەستێك وەکو هەست کردن بە . ئێش و فشار ...هەست بە گەرمی وساردی هەستی بیرەوەری ڕاستی وجوڵانەوەیی و زۆر شتی تر کەناتوانێت بە چاو بیبینێت بە ڵام بە پەنجەکانی دیاری ئەکات .

**3-هەستی بۆن کردن SMELLING**

هەستێکی زۆر گرنکە بۆ نەبینان بەهۆیەوە ئەتوانێ هەست بەهەموو جۆرە شتە سامناکەکان بکات وەکو بۆن... دوکەڵی سوتاو ....وکاز و بەنزین .... بۆنی شتی پیس... کەئەبنە هۆی مەترسی لەسەر ژیانیان، هەر وەها ... بۆنە خۆشەکانیش وەکو بۆنی... گوڵ وعەتر و شتیتر .



**4-هەستی تامکردن**

هەستی تامکردن یەکێکە لە هەستەکان کە جیاوازی تایبەتمەندی خواردەمەنیەکان دەرئەخا وەکو ....ترشی ....وسوێری ....وتونی ....وشیرینی ....تاڵی، ونەبینان بە باشی تواناى ئەو جیاوازیەیان هەیە



تامی توونی



تامی خۆش

**کێشەکانی پەککەوتووی نەبینان :**

**یەکەم : کێشە دەروونییەکان :-**

پەککەوتووی نەبینان هەمیشە هەست ئەکات بە کەم کردن وجیاوازی لەکەسانی ئاساییەوە، وئەمەش دەبێتە هۆی دڵەراوکێی دەروونی ، بۆیە ناتوانرێت لایەنەکانی کەم وکوڕی جەستەی وهەستی دەروونی لەیەك جیابکرێنەوە چونکە پەیوەندیەکی بەهێزیان بەیەکترەوە هەیە بۆیە هەندێ زانیاری ئەوەیان سەلماندووە کە ڕێژەی تووشبوانی.... دەمارگیری ....زیاترە لە نێوان کەسانی نەبینان ، هەرچەند پەککەوتووەکەی زۆر بێت دیاردە نەخۆشیە دەروونیەکانیان خراپتر دەبێ.

پەککەوتووی نەبینان تووشی شڵەژانی دەروونی توند دەبێت بەهۆی ئەوە ناتوانێ جوڵە کردن بە ئازادی و نەبوونی توانای لە کۆنترۆل کردنی ژینگەکەی بکات، هەروەها زانا (کروس) جەختی کردەوە کە هەندێك لە پەککەوتوانی بینین دەناڵێنن بە دەست ... دڵە ڕاوکێ... ...و خەمۆکی ... و شڵەژان ئەم کێشانەش سەر هەڵدەدەن لە ئەنجامی کەموکوڕی، هەروەها پەککەوتووی نا بینان کاتێك هەست

دەکات بە جیاوازیەکی زۆری مامەڵە کردنی لە ماڵەوەوەلە دەرەوە تووشی هەندێ نەخۆشی دەروونی دەبێت وەکو :

**1- دڵەڕاوکێ :**

نەبینان هەست دەکەن کە کەمترن لە کەسانی ئاسایی وهەمیشە بیری لێ دەکەنەوە تاکو تووشی دڵە ڕاوکی دەبێت .ودڵە ڕاوکێش دوو جۆرە لای نەبینان :

أ- دڵە ڕاوکێی جیابوونەوە، کەئەترسێت کەسوکاری وەکو دایك وباوك وخوشك وبراکانی کە پشتی پێوە بەستون لیێ جیابینەوە ووازی لێ بهێنن وەبەجێ بهێلن. (الخطيب :2001)

ب- دڵە ڕاوکێی ئەوەیەتی کە ترسی هەیە کەوا هەموو ژیانی بە کوێری بباتە سەر وچۆن ژیان بباتە سەر .

**2-بێ متمانە بەخوود :**

تاکی نەبینان ناتوانێ کەوا بەئازادی وسەربەخۆیی بجولێتەوە وەکو کەسانی ئاسایی چونکە ترسی ئەوەی هەیە کەوا بکەوێت یان خۆی ئەدا بەشتێکدا تووشی ئێشو ئازار ئەبن یان شتێك ئەشکێنن ....

**3- قەرەبوو کردنەوە :**

نەبینان هەمیشە هەست بە کەمی دەکەن،لەبەر ئەوە هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو کەم وکوڕییان وای لێ بکەن کە زاڵ بن بەسەر کەسانی ئاساییدا، و فشارێکی زۆر ئەخاتە سەر خۆیان وهەوڵ وتەقەلایەکی زۆر ئەدەن تاوەکو بتوانن لەوان باشتر بن لە بوارێکدا .

**دووەم :- کێشە خێزانیەکان :**

ئاراستەکانی خێزانەکان بۆ منداڵی پەککەوتووە نەبینان ڕۆڵێکی زۆر گرنگ ئەبینن بۆ قبوڵ کردنی ئەومنداڵانە یان ڕەتکردنەوەیان، هەروەها گونجاندنی....دەروونی....وکۆمەڵایەتی...وهەڵس وکەوتە جیاوازیەکانی باوکان بۆ

منداڵی پەككەوتووی بینین گرنگی هەیە لە قبوڵكردنی ...كوێری لەلای ئەو منداڵە دواتریش ...ڕۆڵی هەیە لە گونجانی دەروونی و كۆمەڵایەتی ، لێرەدا ڕەفتارو مامەڵەی جیاوازی هەیە لای دایكان وباوكان بەرامبەر منداڵی پەككەوتووی بینین وەك :-

1. قبوڵكردنی ئەو پەككەوتوە
2. ڕەتكردنەوەی ئەو منداڵە
3. چاودێریكردنی زیاتر لە پێویست
4. ئینكاریكردنی بوونی پەككەوتووی یان كوێری بەشێوەیەكی گشتی
5. باوكان و دایكان هەست دەكەن لە منداڵەكانیان تووشی ئەم جۆرە پەككەوتنە بوون لە دەر ئەنجامی گوناهەوە وئەمەش.. تۆڵەسەندنی... خوداییە بۆیان بۆیە نایەوێ كەس باسی بەدبەختی ئەوە بكات و قبوڵیشی ناكات .

لەبەر ئەوە منداڵی نەبینان پێویستی بە چاودێری زیاتر هەیە هەروەها پێویستیشی بە تێر كردن و پاڵنەری خێرا هەیە بەڵام باوكان هەندێ جار لە بەرامبەردا ڕوویە ڕووی دەبێتەوە بە قبوڵ نەكردنی و قەدەغە كردنی ئەو منداڵە، هەندێ لە باوكان ودایكانیش هەست... بەدڵەڕاوكێ ...و دوودڵی ... وبێ توانای دەكەن لە مامەڵە كردن لەگەڵ منداڵە پەككەوتووەكانیان ، كێشەكان دەست بەدەركەوتن دەكەن كاتێك دایكان و باوكان ئامادە نین پەككەوتوەكەبە چاوی قبوڵ بكەن وەك ڕاستیەیەك كە لەوانەیە ببێت بە سەرچاوەی وەڕس كردنی ژیانی خێزانەكە وەك ڕاتەكاندن كاریگەری ئەكات و لەدوای خۆی هەست و شعوری نەرێنی بەجێ ئەهێڵێت وەك یاسایەكی كۆمەڵایەتی كە بەشێوەیەكی ویستی یان ناویستی دایك لەگەڵ منداڵە شیرە خۆرەكەی دەمارگیرو تووڕە ئەبێ دواتریش ئەم دەمارگیریەو تورەییە دەگوازرێتەوە بۆ منداڵەكە.

**کاریگەری مامەڵەی خراپی خێزان لەسەر منداڵی نەبینان :**

1. لە دەسدانی هەستی ئاسایش و دڵنەوایی .
2. پیادەکردنی شێوازی هەندێ ڕەفتاری ناکۆمەڵایەتی .
3. ئارەزوی لە تەنیایی و دابڕان وشەڕان گێزی .
4. بارودۆخێکی نائاسایی بۆ منداڵی نەبینان لەناوخێزاندا .
5. تووشی خراپی ڕەوشت وحەسوودی و ڕق وکینە.
6. کەم ئەزمونی، کە دەبێتە هۆی بەربەست لە گەشەی سروشتی و کۆمەڵایەتی و دەروونی .

**سێیەم:- کێشەکۆمەڵایەتیەکان :**

1- لە کەسانی نەناسراو بێگانە ئەترسێ

2-لە دەست کەم وکوڕی لە چالاکی کۆمەڵایەتی دەنالێنێ بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی وپشت بەخۆ بەستن و پێك هێنانی هاوڕێیەتی .

3-خۆی لە قسەکەر دوو ئەخاتەوە، وبە گوێ چاودێری دەکات ، هەندێ کەس بە بەکەمی دادەنێن گرنگی پێنادەن .

4-ناتوانێت ئاماژە کۆمەڵایەتیە تایبەتیەکان بەکاربێنێ . بۆ بەردەوامی و پەیوەندی نازارەکی .

5- هاورێی کەم هەیە بەشێوەیەکی گشتی پەنا دەباتە بەر دابران و تەنیایی .

6- کەمی ئەزموون دەبێتە هۆی ڕێگرتن لە گەشەی سروشتی وکومەڵایەتی ودەروونی .

7- لە کاتی چالاکیە جیاوازەکاندا گرنگی زیاتر بە خۆی ئەدا نەك بە کەسانی تر.

## جۆرەکانی بەرنامەی پەروەردەیی بۆ فێرکردنی قوتابیانی نەبینان

### 1-تێکەڵاوکردن AMALGAMATION

تێکەڵاوکردنی منداڵانی نەبینان :

بریتیە لە : فێرکردنی منداڵی پەککەوتووی چاو لە قوتابخانە یاساییەکانەوە ودابین کردنی هەموو پێداویستەکانی پەروەدەی تایبەت بۆیان .

### ئامانجی تێکەڵاوکردن

1-لادانی ئەوبەرپرستیە کە لە ناوندی پەککەوتووی نەبینان لەگەڵ کۆمەڵگای قوتابخانە گشتی .

2- دەرخستنی تواناو چالاکی قوتابی پەککەوتووی نەبینا بو فیربون .

3-دورخستنەوەی هەستی نەبینا کەوا ناتوانێ لەگەڵ چاوساغەکان پێش برکێبکات لە خۆیندن وچالاکەکانی قوتابخانە .

4-پەرەپێ دانی کارامەی کەسایەتی وکۆمەڵایەتی بۆ قوتابی نەبینا لە ئاوێتەکردنیان لەگەڵ برادەرە چاوساغەکان .

5-دەرفەت دان بە قوتابیە چاو ساغەکان بۆ شارازا تێگەیشتن لە نابینەکان .

### جۆرەکانی تێکەلاو کردن

تیکەلاّوی ئەکادیمی پێنج جۆرە :

**یەکەم : تێکەڵاو کردن بە درێژایی کات لە پۆلی تایبەتدا :**

ئەم جۆرە بریتیە لە دابین کردنی مامۆستای پسپۆر و پۆلی تایبەتی ودابین کردنی تەکنەلوژی بریل بۆ نەبینا بۆ ئەوەی هەموو بابەتە قوتابخانەییەکان فێربن

**دووەم : تێکەڵاو لە پۆلی تایبەت و هاوبەش :**

لەم جۆرە پێوستیە بە دابین کردنی مامۆستای پسپۆر ودابین کردنی پۆلەکە بە هەموو جۆرە ئامێرێکی تایبەت کە نەبینیان پێویستان پیّ هەیە و لەگەڵ هەندی بابەتی تایبەت، ولەهەمان کاتدا زۆربەی کاتەکانیان لە پۆلی ئاساییدا ئەبەنەسەر.

**سێیەم : ژوری سەرچاوە**

بریتیە لە بەشێك کە هەموو پێویستیەکی تیا دابین کراوە، و پەککەوتەکان سەردانی دەکەن بەپی ئەو خشتەکاتەی بۆیان دانراوە لە کاتی پێویستدا .

**چوارەم : مامۆستای ڕێنماییکار**

یەکێکە لە مامۆستاکانی قوتابخانەکە پسپۆری تایبەتی هەیە لە ڕێنمایی خاوەن پێداویستی تایبەت، هەڵدەستێ بە ڕێنمایی کردنی ئەو قوتابیانە کە پێویستیان پێ هەیە .

## سوودەکانی تێکەڵاو :

1-یاریدەی منداڵی پەککەوتوی چاو بۆ ئەوەی هاوکاری بکات لەگەل منداڵە ئاسایەکان بە بەردەوامی .

2-تێکەلاو بوونی منداڵی پەککەوتوو بێ بەش نابێت لە پەیوەندی بەردەوامی لە ژیانی ئاسودەیی لەناو ماڵ و کۆمەڵگادا .

3-منداڵی پەککەوتووی چاو لە زۆر کێشە دەروونیەکان سەرفراز دەبێت بە هۆی تیکەڵاو بونی لەگەڵ منداڵانی ئاساییەکان، وهەر وەها لەگەڵ منداڵە نەبیناکانیش چونکە بۆی دەر ئەکەوێت هەر خۆی بەتەنیا ئەوکێشەی نیە .

**ڕێنمایی پەککەوتووی نەبینا**

بریتیە لە یارمەتیدانی نەبینا بۆ ئەوەی پەسەندی خۆی بکات و شیکردنەوەی ....کەسایەتی دەروونی....و پەروەردەیی....وکاری ....وخیزانی بۆ بکات، وچارە سەری ئەو کێشەو گرفتەکانی کەپەیوەندی هەیە بە پەکەوتەکەیەوە کەدەرئەنجامی مامەڵکردنی تاکەکانی کۆمەڵەکە هەتاکو بتوانێ بە باشی بگونجێ لەگەڵ بارودۆخەکەیدا، و بتوانێت پەرەپێدانی ئەو بەهرە و توانایەی هەیەتی بەباشترین شێوە بەکاری بهێنێت .

### ئایە پەککەوتوی نەبینان پێویستیان بە ڕێنمایی هەیە ؟

هەموو تاکێکی مرۆڤ لە درێژایی ژیانیدا پێویستی بە ڕێنمایی زۆرە چونکە بێچوی مرۆڤ وەکو بێچوی گیانلەبەرەکانی تر نیە کە بتوانێت پشت بە خۆیەوە ببەستێت تواناى هیچ شتێکی نیە هەر لە دایك دەبێت زۆر پێویستی بەکەسانی ترەوە هەیە بۆ دابین کردنی خواردن وخواردنەوە وپاکوتەمیزی دڵسۆزی وە زۆر شتی پێویست هەیە هەتاکو پشت بە خۆیەوە ئەبەستێت، بەڵام بێچوی گیانلەبەرەکانی تر ڕاستەوخۆ دەست دەکەن بەگەڕان بەشۆێن خواردندا، جگە لەوەی کە مرۆڤ تووشی هەموو جۆرە کێشەیەك دەبێت لە ژیانیدا وئەم کێشانەش جیاوازیان هەیە کەسێك بۆ کەسێکی تر بە تایبە ئەگەر ئەو کەسە نەبینا بێت، ولەو کێشانە وەکو ... کێشە کۆمەڵایەتیەکان .... خێزانیەکان ... بەروەردەیەکان ... دەروونیەکان ... تەندروستیەکان .... سیاسیەکان ... سروشتیەکان ... وکێشە تکنەلوژیەکان، وەڕێنمایی بۆ کەسانی ئاساییەکان وکەسانی نەبینا دەبێت کە زیاتر پێویستیان پێ هەیە .

### ئامانجەکانی ڕێنمایی دەروونی بۆ نەبینان

ریێنمایی دەروونی ئامانجێکی مرۆڤایەتی گرینگی هەیە و ئەو ئامانجەنەش ئەمانەن :-

1-پەککەوتوی نەبینا بەتەواوی هەموو مافێکیان هەیە کە ژیانێکی خۆش خوازی نایاب ببەنە سەر، وهەر وەکو کەسانی ئاسایی هەموو مافێکی مرۆڤیان هەیە .

2-هەرچەندە ئەوانە پەککەوتوی چاویان هەیە، بەڵام هێز وتوانایان لە چاوساغەکان کەمتر نیە، و هەندێکیان بەهرەمەند و توانایان زیاترە لە کەسە ئاساییەکان.

3-دابین کردنی خزمەتگوزاری ...تەندروستی.... وکۆمەڵایەتی....وئابوری چونکە کەسانی پەککەوتو زۆر پێویستیان پێ هەیە .

4-هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئاراستەی خێزان و کۆمەڵگا دەربارەی نەبینا .

5-هەوڵدان بۆ ئەوەی کەسی پەککەوتو نەبێت بە بارێکی قورس بەسەر خێزانەکەی وکۆمەڵگاکەیەوە وهەتا بتوانێت ببێ بەکەسێکی کردار وزانستی بەپێ تواناکانی .

**بوارەکانی ڕێنمایی پەککەوتوی نەبینان**

**یەکەم-ریینمایی دەروونی :**

بریتیە لە پیشکەش کردنی خزمەت گوزارییە پسپۆریەکان ویاریدەی پەککەوتوو ئەدات بۆ :

1-چاکردنی ئاستی گونجاندنی کەسایەتی ..

2-یارمەتی دانی بۆ ڕوبەرووی کێشەکانی ..

3- ڕاستکردنەوەی تێگەیشتن لە خوودی خۆی .

4- ئاراستەی بەرەوروی پەککەوتنەکەی بکرێت بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بگونجێت هەتاکو بارەکەی خراب تر نەبێت ..

5- هاندانی بۆ ئەوەی پشت بەخۆی ببەستێ و واز لە کەسانی تر بهێنێت کە تووشی دڵەراوکێ وهەرەشەکردن دەبێت کەوازی لێ بهێنن .

6- یارمەتی دانی بۆ دوور کەوتنەوەی ئەو شتانە کە دەبێتە هۆی نائۆمێدی ودڵگرانی .

7- هەوڵدانی بۆ ئەوەی زاڵ ببێت بەسەر ڕقهەڵگرتن کە ئەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەی هەڵە.

8- یارمەتی دانی بۆ هەست کردنی بە ئاسایش وئارامی .

**دووەم-ڕێنمایی بە کۆمەڵی**

1. هەوڵ دان بۆ گۆڕینی ئاراستە کۆمەڵایەتیە سلبیەکان وبیرۆکە هەڵەکان کە هەندێ کەس باوەڕیان پێ هەیە دژی نەبینا .

2. بایەخ پێ دانی حەزو ئارەزوەكانی تاكی نەبینا.
3. هەوڵ دان بۆ گۆڕینی بارودۆخ ورەوشت بۆ گونجانی كۆمەڵایەتی .
4. ئامادە كردنی ژینگەیەكی گونجاو بۆ گەشەی كۆمەڵایەتی.
5. هەول دان بۆ گۆڕینی ئاستی دایك وباوك كەوا مندالی نەبینا تۆلەی خوایە .
6. یاریدەی دایك و باوك لە دەرباز بونیان لە هەست كردن بە گوناهباری .
7. هەوڵ دان بۆ ڕەزامەندی تاكەكانی ئەو خێزانە كە مندالی نەبینایان هەیە .

**سێیەم ڕێنمایی پەروەردەیی**

1. مندالی نەبینا مافی پەروەردە و فێربوونی هەیە هەر وەكو كەسی ئاسایی .
2. پەككەوتوو نەبینا وەكو كەسانی تر هەموو ئامادەی و توانای هەیە .
3. یاریدانی نەبینا بۆ جارەسەر كردنی ئەوكێشانەی كە لە قوتابخانە تووشیان دەبێت .
4. دابین كردنی ئەو كەرەستەیە وئامێرانە یەدەكانە كە پێویستیان پێ هەیە، وەكو (چاویلكە ...ئامێری برایل...) وئامێری پەروەردەی تایبەت كە دەبێتە هۆی یاریدە دەریان
5. دابین كردنی مامۆستای پسپۆری تایبە لەو قوتابخانەدا .
6. پەككەوتوی نەبینا مافی خۆیەتی هاوبەشی بكات لە ڕۆشەنبیری خۆش وناخۆشی كۆمەڵگاكەی .نەوەك بارێكی قورس بێت بەسەریەوە .
7. دابین كردنی هاتووچۆیان لە ماڵەوە بۆ قوتابخانە
8. دابین كردنی قوتابخانەی تایبەت كە گونجاوبێ بۆیان وەكو شوێنی یاری ..و پێپلیكە ..و تەوالێت .

**چوارەم : ڕێنمایی تەندروستی**

1. گرنگی ئەدا بە چارەسەر کردن بە باشترین پلە .
2. هەوڵ دان بۆ چارەسەرکردنیان ودابین کردنی پزیشکی پسپۆری وە نەشتەگەری لە کاتێ پێویستیدا .
3. جەخت کردن لە سەلامەتی تەندروستیان وبەدوا چونیدا بەشێوەیەکی بەردەوام .
4. دابین کردنی هەموو جۆرە ئامێرێکی یەدەکە وەکو ئامێری گەورە کردن .....چاویلکەی تەندروستی کە یاریدەرو بو باش بینین .
5. راهێنانیان بۆ بەکارهێنانی گۆچان بۆ ئاسوودەی جەستەیی دەروونی .

**پێنجەم : ڕێنمایی کار**

هەنگاوی سەرەکی لە لە ڕێنمایی کاردا یاریدانی پەککەوتوی نەبینایە بۆ ئەوەی لەخوودی خۆی تێ بگات وتواناو ئاستی کرداری خۆی بزانێت کاری پێ بکات وببێت بە تاکێکی بەکەڵك لە کۆمەڵگاکەیدا، ویاریدەدانی بۆ بەدەست هینانی گونجاندن وفێر بوونی کار، هەروەها کارێکی گونجاوی بۆ دابین بکرێت کە گونجاوبێت لە گەڵ تواناکانیدا .

ڕێنمایی کار هەڵدەستی بە فێرکردن و ڕاهێنان نەبینا کە ببێت بە کەسێکی شایستە چونکە کۆمەڵگا دەبێت جێگەی هەموو کەسێکی بگرێتە خۆی بەبێ جیاوازی، وئەبێت ورووژاندنی هاندەری ئیش وکار بەرهەم بکات تا دوا پلە کە نەبینایان بتوانن چەسپاندنی بڕوا بەخۆیانەوە بکەن وتوانای ئیش وکار وبەرهەم تاکو ژیان ببەنەسەر .

# بەشی : نـــــــــۆیەم

## ئۆتیزم

پوختەیـەكی مێـژووی دەربـارەی بایـەخ پێـدان بـە سەرهەڵدانی ئۆتیزم

ئۆتیزم چییە ؟

نیشانەكانی منداڵی ئۆتیزم

توانای تایبەتمەندیەكان

هۆكاری شڵە ژانی ئۆتیزم

جۆرەكانی شڵە ژانی ئۆتیزم

یەكەم : ئۆتیزمی دەستوری كۆن (التقلیدی)

دووەم : شڵەژانی ئیسپرچر

سێیەم : شڵەژانی ڕێت

چوارەم: نیشانەكانی كرۆمۆسۆم Xتوانای شكانن X

رۆلێ ڕێنمایی كار لەگەڵ منداڵی ئۆتیزمدا

# بەشی :نۆیەم:

# ئۆتیزم : Autism

## پوختەیەکی مێژووی دەربارەی بایەخ پێدان بە سەرهەڵدانی ئۆتیزم:

ئۆتیزم وشەیەکی یۆنانیە Autos بەمانای خوود یان دەروون بۆ یەکەم جار ئەم زاراوەیە لە لایەن پزیشکی دەروونی ئەمەریکی لیو کانەر (Kannar1943 ) دۆزرایەوە کە بۆی دەرکەوت لە ناو ئەو منداڵە بیرکۆڵانە کە چارەسەریان ئەکات یانزە منداڵ نیشانەی نەخۆشیەکانیان جیاوازە لەگەڵ نیشانەکانی بیرکۆڵان، وەبۆچونی وابوو کە زۆر نزیکە لە شیزۆفرینیا Schizophrenia بەڵام هەندێ جیاوازیان هەیە و بەناوی (ئۆتیزم Autism) دیاری کراون .

لە ساڵی (1944) پزیشکی نەمساوی (ئسپجر Asperger) لێکۆڵینەوەیەکی بەسەر چەند منداڵێکی نەمساوی کرد کە نیشانەی نەخۆشیەکەیان هەمان جۆرە لە گەڵ ئەو منداڵانەی کە (کانەر) دیاری کردبوو، بەڵام بەهۆی شەری جیهانی دووەمەوە بلاو نەبووە، و کە پزیشکی دەروونی (Lwing) کەمنداڵە کەی هەمان نەخۆشی هەبوو تۆیژینەکەی بە زمانی ئینگلیزی بڵاو کردەوە و لەو کاتەوە بە ناوی ئسپجر دیاری کرا . (عبدالرحمن والاخرون :2005)

## ئۆتیزم چییە Autism؟

ئۆتیزم بریتیە لە تێکچونی ئاڵۆزی گەشەکردنی مێشك کەکار دەکاتە سەر کارو فەرمان وچالاکیەکانی،وکاریگەری توندی هەیە لە ڕووی تێکەڵاو بوونی کۆمەڵایەتی وەنەبوونی پەیوەندی قسە کردن وفێرکردن وهەڵسوکەوت. و ئۆتیزم

کاریگەری هەیە لە ڕووی گەشەی لە بواری ...ژیانی تێکەل بوونی کۆمەلایەتی (دابڕانی کۆمولایەتی)...و هاتنەگۆ ....وتێگەیشتن....وپەیوەندی (communication) هەروەها.... دابڕانی تێگەیشتن لەگەڵ کەسانی تر.




لە ئەنجامی تۆیژینەوە زانستیەکاندا هاتوە کە ئەم نەخۆشیە لە شەش مانگی یەکەمەوە دایك وباوك هەستی پێ دەکەن، بەلاّم لە سێ ساڵیدا بەزۆری دەرئەکەوێت و بەردەوام دەبێ لە هەموو ژیانی ئەو منداڵەدا، هەندێ لە منداڵی ئۆتیزم توانینی پەککەوتوی خوێندنیان هەیە بەڵام هەموویان بەیەك جار بەگرانی لە مانای ژیان تێ ناگەن .

## نیشانەکانی منداڵی ئۆتیزم :Characteristies of Autistic Children

زۆربەی نیشانەکانی منداڵی ئۆتیزم لە سێ ساڵی یەکەمدا دەرئەکەوێ وەکو :

**یەکەم: نەبوونی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان :Social defect پەیوەندی کۆمەلایەتی پێك دێت لەم خاڵانەی خوارەوە :**

1. منداڵی ئۆتیزم گۆشەگیری پێوەدیارە ئارەزوی کەنار گرتن وتەنیایی هەیە.

2. کاتێکی زۆر کەم لەگەڵ دایك وباوکی کەس وکاری ئەباتە سەر .
3. هەستی خۆشی دەرنابڕێت کە دایك وباوکی ئەبینێ .
4. توانای چاو تێبرینی کەمە، ڕاستەخۆ تەماشای ناوچاوی خەڵکی ناکات تەنانەت چاو نابڕێتە ناو چاوی دایکیشی .(محمد:2002)
5. بایەخ نادات بە پێکهینانی هاوڕێیەتی .
6. سەرنجی زۆر کەمە لە نازاریە کۆمەڵایەتیەکان وەکو زەردەخەنە ..تەماشا کردن..گۆی گرتن.... .
7. هەست ناکات بە هەست کردنی کەسانی تر وەکوکە دایکی غەمبار بێت یان بگری وهیچ کاری لێ ناکات.
8. وەڵام دانەوەی بۆ یاری وشتەکانی زیاترە لە وەڵام دانەوەی بۆ کەسەکان .
9. منداڵی ئۆتیزم ناتوانێ پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەوروبەر و کەسانی نزیکی خۆیدا ببەستێ .



**دووەم: لاوازی پەیوەندی زارەکی قسە کردن: Language defect**

أ- منداڵی ئۆتیزم لاوازییەکی زۆری هەیە لە پەیوەندی قسە کردندا .

ب- گەشە کردنی زمانی زۆرسستە یان هیچ گەشە ناکات، وا دەر ئەکەوێ کە منداڵێکی کەرو لاڵە .

ج- منداڵی ئۆتیزم وتووێژ ناکات وناتوانێ ڕستەکە تەواو بکات .

د- تێ ناگات لە قسەو مانای وشەکانی کەسانی تر .
هـ- ناتوانێ بەشێوەیەکی ڕاستی وەڵامی ئەو ئامۆژگاریانەی کە ئاراستەی ئەکرێت بداتەوە .(فرا996)
و- هەمیشە دووبارەی هەندێ ووشەی تایبەت ئەکاتەوە یان دووبارەکردنی دوا وشەیەك لەسەر یەك کە گۆی لێ بووە .
ز- توانای دەست پێ کردنی گفتو گۆی لە گەڵ کەسانی تر نیە و ناتوانێ بەر دەوام بێ .
ح- منداڵی ئۆتیزم لە دوای تەمەنی 3 ساڵیەوە بە تەواویی لە قسەو ووشە دەربڕین دادەبڕێن .

**سێیەم: نواندنی ڕەفتاری ناپەسەند وەکو :**

1-ئەومنداڵانە بەرهەڵستی هەمووجۆرە گۆڕانکاریەك لەرۆتین ئەبن وەکو گۆڕین لەشۆینێکەوە بۆ شۆینیکی تر... یان گۆڕینی جل و بەرگی....
2 -دەق ئەگرێ بە جۆرێ لە خواردن ونایەوێ بیگۆڕێ و زۆر بە زەحمەت ڕوو لەجۆرەکانی تری خواردەمەنی ئەکات .
3-دووبارە کردنی هەمان یاری چەند جارێك بە بێ ماندو بوون، وچالاکیەکانی زیاترە لە منداڵی ئاسایی .
4-رق گرتن وتورەیی وزیاد بوونی لەگەڵ تەمەنی ئەومنداڵە .
5-لە باتی قسە کردن فرە فڕ بە دەست وقاچی ولەرزینی جەستەیی ئەکات .
6-زۆر جار تووشی حاڵەتی پێکەنینێکی بێ هۆ ئەبێ
7- شکاندنی ئەو شتانەی ئەکەوێتە بەر دەستی لە کاتی تورەییدا .
8-سەری ئەکوتێ بە دیوارەوە بەبێ هیچ هۆیەك .
9-ناتوانێ هەست و نەستی کەسانی تر لە بەرامبەر خۆیا یەکلابکاتەوە چونکە توانای پەیوەندی و گفتوگۆی نیە.
10-هەست کردنی خواردنی زۆر لاوازە، لەبەر ئەوە هەمیشە تووشی شلەژانی گەدەئەبێ .

11-هەست بەو شۆینانە ناکات کە ترسناکن ودەبێتە هۆی ئێش وئازار بۆی .

12-شلە ژانی هەستکردنی بەئێشو ئازارکردن لەوانەیە ئەوهەستەی بەتەواوی ئەما بێ یان هەستێکی زۆر ترسناکی هەیە بەهەر ئێش و ئازارێك .

13- مندالی ئۆتیزم خەو نوستنی زۆرکەمە لەوانەیە چەند چرکەیەك بنونن وهیچ فەرقی شەو رۆژ ناکەن .

14-هەستنەکردن وبەسەرماو گەرما ناکات .

**چوارەم: شتی نەرینی :Negative**

1- مندالی ئۆتیزم حەزو ئارەزوی بەو شتانەی هەیە ونایەوێت بیگۆرێ وەکو جۆری یاریەکەی، یان پەیوەندی بە تاکێکی خێزانەکەی یان گۆرینی پۆشاکەکانی.



2-پێ ناخۆشە کەسانی تر بیگرنە باوەش یان ماچی بکەن .

3-لە سەر پەنجەی پێ ئەروات وبە جۆرێك ئەروات بە رێوە هەر وەکو دوو هەنگاو بۆ پێشەوە ودووش بۆ دواوە .

4- ئارەزوی بازدانی هەیە لە سەر جێکە بەرزەکان بە بێ ئەوەی هەست بە ترسناکی بکات .

5-ئارەزوی یاری کردنی هەیە بە سەرچاوە کارەبا ییەکانەوە بە بێ ئەوەی بترسێ (القمش:2001)

6-گاز لە خۆی ئەگرێ هەتاکو خۆیینی لێ بێ،وسەریشی زۆر ئەکوتێ بەدیوارا لەبەر ئەوە هەمیشە ئاوساوە یان بریندارە .

7-لە هەندێ شت ئەترسێ کە پێویست بە ترس ناکات وەك ترسان لە دەنگی هەندێ ئامرازە کارەباییەکان وەکو( گسکی کارەبایی ...قژ وشك کەرەوە...جل شۆر)، ودەنگی فڕۆکە وئاژەڵ .

#### 4- توانا تایبەتمەندیەکان: SPECIAL ABILITIES

هەرچەندە منداڵی ئۆتیزم کەم و کۆڕییان هەیە لە زۆر شتدا بەڵام توانیستی و لێوەشاندنێکی باشیان هەیە کە دەور وپشتیان سەرسام ئەکات . ئەو تواناکانەی هەندێ منداڵی ئۆتیزم هەیەتی وەکو :

1-**توانای میوزیك ژەنی** : (السعد1998 ) دەڵێ منداڵێکی ئۆتیزمی یابانی دیوە تەمەنی (12) ساڵ بو توانیویەتی پارچەیەك میوزیکی جیهانی بژەنێ لە چەند چرکەیەکدا، وبەبێ ئەوەی نۆتە بەکار بهێنێ کە یەکەم جار بیستبوی هەر وەکو کەسێکی پرۆفیشناڵ.

2-**توانای بیرکاری**: هەندێ منداڵی ئۆتیزم توانایەکی زۆر بەهێزیان هەیە لە بیرکاریدا هەر لە تەمەنی منداڵیدا دەر ئەکەوی، وەهەندێکی تریان توانای زۆریان هەیە لە چارەسەر کردنی مسەئەلە ژمێرداریە قورسەکانەوە وتوانای بەرهەمی لێکدان ودابەش کردنیان هەیە بەبێ بەکارهێنانی ئامێری ژماردن کەکەسانی ئاسایی توانای ئەوەیان نیە.

3-لە منداڵیەوە توانای بەکار هێنانی ئامێرە کارەبایەکانیان زۆر بە باشی هەیە.

4-هەندێکیان توانای وێنە کێشانیان زۆر بە وردی هەیە، بۆ نمونە : منداڵێکی ئینگلیزی تەمەن (10) ساڵی وینەی پەیکەری سەربەستی ئەمەریکای کێشاوە بە مەرجێك یەك جار ئەو پەیکەرەی دیوە .

لێــرەدا دەرئەکــەوێت کــە ئــەم توانــا ولێهاتوییانــە (لیهاتوی....ومیوزیــك ...بیرکاری ...یادەوەری ... بینین وخەیاڵ ) پەیوەند نیە بە زمانەوانیەوە .

## هۆکاری شلەژانی ئۆتیزم : Causes of Autism

زانــا و توێــژەران لــە ئــەنجامی هەوڵــەکانیان تــاکو ئێســتا نەگەیشــتونەتە ڕێککەوتنێك بۆ دۆزینەوەی هۆکاری شلەژانی ئۆتیزم، جێ سەرنجە کەپەکــەوتنێکی ناڕوونی دەورەی داوە، بەڵام لەسەر چەند هۆیەك ڕێك کەوتون وەکو :

### یەکەم : هۆکاری بایۆلۆژی :

1- تێك چوونی مێشکی کۆرپە پێش و پاش لەدایك بووندا .
2-تووش بوونی دایکی دوو گیان بە سورێژەی ئەڵمانی .
3-خنکانی کۆرپە لە کاتی لە دایك بووندا .
4-لە کاتی تیشك گرتن دایکی دوو گیان
5-ئالودەبوونی دایکی دوو گیان بە مادەهۆش بەرەکان ومەی وجگەرەکێشان.
6-ئالۆزبوونی لە دایك بوونی منداڵی ئوتیزم زۆرترە لە منداڵە ئاساییەکان.
7-سەردانی ئۆتیزم وبڵاو بوونەوەی لە نێرینەکاندا زیاترە لە مێەکان و ئەمــەش ئەگەڕیتەوە بۆ هۆکارە ئەندامەییەکان (العضوية).

### دووەم : هۆکاری جینی:

أ- هەندێ لــە توێژینــەوەکان هۆکــاری ئــۆتیزم ئەگەڕیننــەوە بــۆ تێــك چــوونی کرۆمۆسومەکان کە پەیوەندیان هەیە لەگەڵ کرۆموسۆمی(X) کــە بــەرواری 5%-16%، هەروەها تووشی ئەو منداڵانــە دەبێــت کــە لــە خیزانەکانیانــدا شــڵە ژانــی بۆماوەی وکۆئەندامی هەیە.

**سێیەم : تێکچوونی ئەرکەکانی کۆ ئەندامی دەماری:**

تویژینەوەکان جەخت دەکەن کە(32،4%) ی منداڵی ئۆتیزم تووشی بارودۆخی فێ ئەبن . (الماغوث:2004)

**چوارەم : تێکچوونی ئەرکەکانی مێشك :**

لەڕوانگەی بیرۆدۆزەکانی هۆکاری ئۆتیزم تێکچونی ڕووداوی ڕاستاندن کە دەرئەنجامی ناتوانێ پێشوازی هەستیارەکان ڕێك بکات،و ئەبیتە هۆی شلە ژانی فێربونی و سازانی لە ژینکەکەیدا، لە ئەنجامدا تووشی گۆشەگیری و تێکچوونی ڕاستاندنی بیستن دەبێ کە دایك وباوکی هەست دەکەن کە منداڵەکەیان کەرو لاڵە.

**پێنجەم : هۆکاری دەروونی و خێزانی :**

زانایانی ئەم بیرۆکەیە هۆکاری شڵە ژانی ئۆتیزم دەگێڕنەوە بۆهۆی دەروونی و خێزانی، لەبەر ئەوەی خێزان ڕۆڵێکی زۆر گەورە ئەبینێت بە تایبەت ڕۆڵی دایك ..لە نەبوونی پەیوەندی ... سوز ...و هەست ...ودڵ نەرمی ....وچاودێری باشی ..بەگورپەکەیەوە لە ساڵەکانی یەکەمی منداڵیدا تووشی ئەوشڵە ژانە ئەبێ، وپەیوەندی نائاسایی لە بەینی دایك وباوکدا کەئەبێت بە کەمی پەیوەندی لە گەڵ دایك وکۆرپەکەیدا، وبڕوایان وایە کە زۆرترین ڕێژەی منداڵی ئۆتیزم لای ئەو خێزانانە سەرهەڵئەدات، هەروەها ئەو دایك وباوکانە کە منداڵی ئۆتیزمیان دەبێت ئاستی ڕۆشەنبیری وزیرەکیان لەسەروی مامناوندیدایە کە کەسایەتیان مەیلی وەسواسیان بێت لەگەڵ سستی لاوازی هەست وسۆزیان بێت .

**جۆرەکانی شڵەژانی ئۆتیزم :**

زاراوەی ئۆتیزم بەکاردێت بۆ هەموو جۆرەکانی بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام ئۆتیزم چەند جۆرێکە، لەبەر ئەوەی هەندێ نیشانە هەیە وەکو کەم و کۆری لە پەیوەندی بینین وقسەکردن وتوانای تیگەیشتن ....زۆربەیان بەشدارن، لێرەدا هەوڵ ئەدەین چەندیان دیاری بکەین وەکو :-

یەکەم : ئۆتیزمی دەستوری کۆن (التقلیدی): AUTISM CLASICAL

نیشانەکانی(کانیر 1973) کە لە پەرتووکە بە ناوبانگەکەی (الذهان العقلي ) بڵاوی کردەوە کە ئەم جۆرە بەزۆری بڵاوە لە ناو منداڵاندا وبەم شێوەیە :

1. گەشە کردنیان زۆر کەمە
2. لاوازی قسەکردن و وادەرئەکەویت کە منداڵیکی کەڕ ولاڵە وقسەکانی همهمە کە کەس لێ تێ ناگات .
3. لاوازی پەیوەندی کومەڵایەتیەکان، وگۆشەگیری ودووره پەریزیان هەیە .
4. ئارەزوی گۆڕان کاریان نیە لە گۆران کاریەکانی ژیانیانەوە( الحياة الروتينية) وەکو جۆری خواردن ...پۆشاك ...گۆڕان کاری شتومەك وياريەكان....

5- وەلام دانەوەيان نیە بۆ دەنگە بەرزەکان وگاڵتەو وهەستەکان Shah;1995).

6- ئەم جۆرە تەقلیدیە تووشی ئەو منداڵانە دەبێت کە تەمەنیان لەسێ ساڵ یان کەمتر دەبێت .

7- جوڵەیان زۆرە وبەردەوامی بێ مەبەستە .

8-لە منداڵیەوە توانای بەکار هێنانی ئامێرە کارەبایەکانیان زۆر بە باشی هەیە.

9-هەندیکیان توانای وێنەکیشانی زۆر وردیان هەیە

10- لێرەدا دەرئەکەوێت کە ئەم توانا ولێهاتوییانە (لیهاتو....ومیوزیك ... بیرکاری ...یاردەوەری ... بینین وشوێنی ) پەیوەند نیە بە زمانەوانیەوە .دەرکەوت لە تاقینەوەی زیرەکی پراتیکی لیهاتوو وتواناکانیان باشترە لە ئەومنداڵانە کە سەنگی خۆیندنیان هەیە.

دوووەم :شلەژانی ئیسپرچر : ASPERGER'S DISORDER

شلەژانی نیشانەکانی ئیسپیرجر بەناوی پزیشکی نەمساوی Hans (Sperger1944, ) کە یەکێکە لە شلە ژانەکانی کەسایەتی ، ونیشانەکانی ئەم خاڵانەی خوارەوەیە :

1. لاوازی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان .
2. پلەی زیرەکیان ناوەندی یان زیاترە.
3. بــەرنگاری لــە گۆڕانکاریــەکان وەکــو هــەمان جۆرەخواردنێــك ... ولەبەرکردنی پۆشاکیکی دیاری کراو .
4. هەستیاریکی زۆریان هەیە لە دەنگی بەرز وهەرا .
5. هەندێکیان توانای زۆریان هەیە وەکو توانای نائاسایی لە بیرکردنەوەدا.
6. ئارەزوی کەنارگرتنیان هەیە، وبلیمەت وبەهرەداریان تیا هەڵدەکەوێ .
7. هەمیشە دڵەڕاوکێ وخەمۆکی وشەڕانگێزن .

سێەم :شڵەژانی ڕێت : RETT'S DISORDER

شلە ژانی ڕێت یەکیکە لە هۆی پەکەوتووی منداڵان، کە ڕێت لــە ســاڵی 1966 دۆزیەوە وبریتیە لە شلۆقی زۆر لە مێشکدا زیاتر تووشی مییەکان ئەبێت بە ڕێژەی (4:1) لەبەر ئەوەی زۆر ی نیشانەکانیان لە یەك ئەچــێت لەگــەڵ ئــۆتیزم هەنــدێك بەئۆتیزمیان دانائەنێن، بەلام لەبەر بوونی چەند جیاوازێەکدا ئەیان خەنــە ڕیزی،ئــەم شڵەژانیە، ونیشانەکانی ڕێت ئەم خاڵانەی خوارەوەئەگرێتەوە: (Gerabd;1980)

1. تواناى لە بەکار هێنانی دەستەکانی نیەبە شێوەیەکی باش .
2. توانای پەیوەندی و گفتو گۆیان نیە .
3. لاوازێیەکی زۆری هەیە لە گەشەکردن وبیرکردندا .
4. پێکەنینێکی هستیری بەبێ هۆی هەیە .
5. تێکچونی ماسولکەکانی دەبێتە هۆی پەککەوتوی جوڵانەوە وڕێ نەکردنی .
6. راستەخۆ تەماشای ناوچاوی خەڵکی ناکات تەنانەت چاو نابڕێتە نــاو چــاوی دایکیشی. (Baroins;1997)
7. ناتوانن هەست و نەستی کەسانی تر لە بەرامبەر خۆیان یە کلا بکەنەوە
8. شڵە ژانی ڕێت پەیوەندیەکی زۆری هەیە بە پەککەوتووی ئەقڵی هەیە .

**چوارەم: نیشانەکانی کرۆمۆسۆم Xتوانای شکانن FRAGILE X SYNDROM**

بایلی وئەوانی تر (Bailey. et als 1993 ) جەخیان لە سەرئەوە کردوەتــەوە کە تووش بوون بە پەککەوتووی کرۆمۆسۆمی لاوازی و نائاسایای (X)،ئەم شلەژانە تووشی پەککەوتوانی ئەقلی دەبێت،(Simon2002)

بایلی جەخت لەوە ئەکاتەوە کەمنداڵی تووش بوو بەم نەخۆشیە دوو جۆرە:-

أ-: خەسڵەتە جستەییەکان :

1. گەورەیی ئێسکی دەموچاوی
2. دانەکانی لاوازن
3. چاو خێلی
4. دەموچاوی درێژە وتەسکە
5. قاچەکانی باریکە
6. تێك چوونی خانەکانی دڵی
7. بە هێواشی وەڵامی هەستیارەکانی ئەداتەوە

ب-: خەسڵەتە ڕەفتاریەکان :

1. پە یوەندی کۆمەڵایەتی دروست ناکەن ناتوانن هاوڕێ بۆ خۆیان دروست بکەن.
2. توانای پەیوەند ی و گفتو گۆیان نیە وقسەکانیان دووبارە دەکەنەوە
3. لەباتی قسەکردن دەست و پەنجەکانیان ئەجولێیننەوە .
4. گرفت وکێشە لە بواری سەرنج دان وچرکردنەوە .
5. چالاکی جولانەوەی زۆر لەگەڵ شەڕان گێڕی وتوڕەیی (الزریقات2004)

**ڕۆلی ڕێنماییکار لەگەڵ مندالی ئۆتیزمدا :**

1-بە چاوێك سەیری ئەو منداڵە بکات کەوا منداڵیکی ئاساییە، وئاستی خـۆی بینێتە ئاستی ئەو منداڵە لەفکر وخەیاڵ کردنەوە.

2-بەباشی گۆیی لێ بگرێت، هەوڵ بدات بۆ جێبەجێ پێویستییەکانی.

3- پاداشت کردنی ڕاستەوخۆ بۆ هەر ڕەفتارێکی باش کە ئەنجامی ئەدا.
4-جیاوازی نەکرێ لەگەڵ منداڵە ئاسایەکان .
5-هەوڵ بدات کەوا بەیاری وکـەل و پـەلی بەسـودەوە خـەریکی بکـات چـونکە زۆربەیان گۆشەگیریان هەیە بە جولەو بیرکردنـەوەی خـود و ئـازاری جەسـتەی خۆیانەوە.
6- بەیاخدان بەومنداڵە وبەئارامی مامەڵەی لەگەل بکرێت چونکە ئەگەر دەستی بەتاڵ بێ ئەو کاتە گاز لـە دەسـتی خـۆی دەگرێـت یـان سـەری بـە دیـواردا ئەکێشێت .
7-راهێنانی ئەو منداڵە بۆ تێگەیشتنی ژینگەی دەوروپشـتی، وبایـەخ پێـدانی هەتاکو بتوانێ سوود لە هـەموو توانـاو لێهاتوەکـانی وەربگرێـت، بـۆ نمونـە ڕێنماییکار ئـەتوانێ فێـری ئـەو شـتانەی کـات کـە لـە دەورو پشـتیایەتی بەشێوەیەکی ئاسان چەند جارێ دووبارەی بکاتەوە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا .
8-هەوڵ دانی ئـەو منداڵـە بـۆ یارمـەتی و بەشـداری یـاری کـردن و چـالاکییە کۆمەلایەتیە جـۆراو جۆرەکـان لەگـەڵ منداڵانـە ئاسـایەکاندا بـە مەبەسـتی تێکەڵاوبونی .
9-دورخستنەوەی ئەو منداڵە لەو شتانەی ئەبنە هۆی هەڵچوونی تووڕە بوونی.
10-هەولدان بۆ تێکەڵاو کردنی ئەو منداڵـە لـەو ژینگـەو کۆمەڵگایـەی تیـادا ئەژی، ئەمەش بە وەرگرتنی لە بەرنامەی ڕاهێنان کـە لـە قوتابخانـە یـان لـە بنکەی ڕاهێنانەکانی تـر، لێکۆڵینـەوەکان جـەخت لەسـەر گرنگـی تیکـەڵاو کردنی منداڵی ئۆتیزم وخێزانـەکانیان چـەند بـە کەڵکـە بـۆ ئـەو منداڵانـەو خێزانەکانیان .
11-هەولدان بۆ بـەهێز کردنـی پەیوەندییـە کۆمـەڵاتی و سـۆز دیارەکـانی ئـەو منداڵە .
12-هەولدان بۆ ڕێکخستنی و هێمن کردنەوەی ئەو منداڵە و دوور بکەونـەوە لـە تێکدانی شتومەکەکانی ماڵ یان جێگەکانی تر .

13- سەرقاڵ کردنی ئەو منداڵە بۆ جێبەجێ کردنی ئیشێك کە ئارەزوی لە سەر بێت .

15-فێرکردن و ڕاهێنانی ئەو منداڵە لە سەر دەست پێشخەری کومەڵایەتیەکان وەکو :

أ- سڵاو کردن .

ب- ئارەزوی خواردن وخواردنەوە ..

ج- داوای یارمەتی .

د- هەست کردن بە یاری کۆمەڵی



## سەرچاوەکان


- إبراهيم عبد الله زريقات (2004) . التوحد بين الخصائص و العلاج . عمان، دار الأوائل للطباعة و النشر .
- ابو سيف،حسام احمد محمد(2006)،الطفل التوحدي،ايتراك للنشرالقاهرة \مصر
- جروان،فتحي عبدالرحمن (2008 ) اساليب الكشف عن الموهوبين،ط2دار الفكر عمان
- جروان، فتحي عبدالرحمن (2008).الموهبة والتميز والإبداع، ط3 الخطيب،
- جمال، تعديل السلوك - القوانين والاجراءات - ط1، 1987م ، عمّان: دار الفكر
- حكيم،رابية إبراهيم (2004) . دليلك للتعامل مع التوحد . جده، مكتبة الملك فهد الوطنية .
- الخطيب، جمال والحديدي، منى والسرطاوي، عبد العزيز(1992). إرشاد أسر الأطفال ذوي الحاجات الخاصة – قراءات حديثة، ط2، عمّان: دار حنين.
- الخطيب، جمال،( 2001) أولياء أمور الأطفال المعاقين - استراتيجيات العمل معهم وتدريبهم ودعمهم - ، إصدارات أكاديمية التربية الخاصة، الرياض، ط1م.
- الرقب،اسامة حمدان ،2012 تعليم الطلاب ذوي الإعاقات الحركية، جامعة العلوم الانسانية،مجلةاتحاد المعوقين الحركية بالعزازي.
- زهران، حامد عبدالسلام (1980)، التوجيه والارشاد النفسي، ط2، عالم الكتب \القاهرة\مصر.

- الزهراني، أحمد خميس (1999). برنامج إرشادي مقترح لتنمية بعض جوانب الشخصية لدى الأطفال الموهوبين. ورقة عمل مقدمة لمؤتمر الطفل الموهوب استثمار للمستقبل. البحرين: الجمعية البحرينية .منامة
- سرور، ناديا هايل (1998). مدخل إلى تربية المتميزين والموهوبين، ط1، عمّان.
- السعد،سميرة .( 1992)،معاناتي والتوحد،الطبعة الاولى،دارالشويخ،الكويت)
- عادل، عبد الله محمد (2002) . الأطفال التوحديون . القاهرة، دار الرشاد للطباعة والنشر .
- عبدالرحمن، محمد السيد،والاخرين( 2005) رِعاية الأطفال التوحديين، دارالسحاب للنشر،القاهرة\مصر
- عبدالعزيز،سعد،(2008)،ارشاد ذووي الاحتياجات الخاصة، دارالثقافة للنشر، عمان /الأردن.
- شريف،عبدالستارطاهر،(1985)،قاموس علم النفس،مطبعة علاء،بغداد العراق
- فراج، عثمان (1996)، إعاقة التوحد او الاجترار،النشرةالدورية لاتحاد هيئات رِعاية الفئات الخاصة والمعوقين،العدد(40)ص (2-8ا لقاهرة/مصر .
- القذافي، رِمضان محمد (1996). رِعاية الموهوبين والمبدعين. الإسكندرية: المكتبة الجامعية.
- القمش،مصطفى نوري،(2011)،اضطرابات التوحد،دار المسيرة ط1 عمان \الاردن
- كريفر،ليندا سلفرمان (2004)،ارشاد الموهوبين والمتفوقين،ترجمة سعيد حسني العزة، دار الثقافة للنشر،عمان |الاردن .
- ملاطاهر،شەوبو عبدالله، (2003 )الاضطربات التي يعاني منها الاطفال في اقليم كردستان اسبابها و مقترحات علاجها

- ـــــــــــــــــ،( 2003 )، اساليب معاملة الوالدية وعلاقتها الانجاز الدراسي لدى طلبة المتوسطة،بحث مشترك
- ـــــــــــــ 2005(الحاجات الارشادية لمرحلة الطفولة المتاخرة في مدينة كويه) مؤتمر الانماء النفسي والتربوي للانسان العربي في ضوء جودة الحياة للفترة من 15-17| مايس| 2005 جامعة زقازيق | مصر
- ـــــــــــ2012 (ظاهرة اطفال الشوارع في مدينة اربيل اسبابها، ووضع استراتيجية عامة للحد والتحدي لها) مؤتمر جامعة صلاح الدين | اربيل
- ـــــــــــــــ (للفترة 28-30| اذار| 2012 )الاضطرابات النفسية لدى الاطفال العراق مؤتمر علم النفس | كلية التربية | جامعة كويت
- ـــــــــــــ،(2014)، مشكلات التلاميذ في مدارس تربية الاساس في مدينة اربيل،مجلة الاكاديميا الكوردية العدد 5
- ــــــــــــــ ( 2015) , المشكلات الارشادية،اسبابها ...ودور المرشد النفسي في حلها،مطبعه جامعه صلاح الدىن/اربيل
- ملحم،سامي محمد(2001)،الارشاد والعلاج النفسي،الاسس النظريتروالتبيقية، دار المسيرةللنشر ط1 عمان\عمان
- الملغوث،فهد حمد (2004) . كل ما يهمك معرفته عن اضطراب التوحد . الرياض، مكتبة الملك فهد الوطنية .
- منسي، حسن والاخرون،(2004)،التوجيه والارشاد النفسي ونظرياته،ط1دار الكندي اربد\الاردن.
- نصر الله، عمر، الأطفال ذوي الاحتياجات الخاصة وتأثيرهم على الأسرة والمجتمع، دار وائل،عمان، ط1، 2002م.
- الوزنة طلعت حمزة ( 2005 ) . المشروع الوطني لبحث التوحد واضطرابات النمو المماثلة لدى الأطفال السعوديين . الرياض، الجمعية السعودية للتوحد .

- Adamson,G.,&Vernon,D.F (1977)ThePsychology andaeducation of gifted children .Uk،Londn:Methuen& Co.Ltd .
- Autism Society of America ( 2005 ) . What Is Autism? . Retrieved from the world wide web، Available at:
- Baily A,Botlon, P.Butler,( 1999);Prevalence of the frigileanomaly amongst autism twinsand singletons child psychology Vol (34) N o5 pp 354 -368
- Baroin-Choen, S.(1994); Do People with Autism understand what cases emotion O'Gorman Child development Vol., (62), p 382
- Dorman، Ben & Lefever, Jennifer ( 1999. ( , Retrieved from the world wide web in 2005 ،Available at : http://lov-e.com/linkPPes/autism.html
- Shah A; Frith U,( 1993 why do autistic individuahs superior the block design task ?Psychat. per
- Baroin-Choen, S.(1994); Do People with Autism understand what cases emotion O'Gorman
- Child development Vol., (62), p 382.
- sign task ?Psychat. performance on Vol.(34)no.(8),pp 1351-136
- , Gerahd,(1970) :The nature of childhood Autism, Second Edition,London ;Butter worthies.

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا :

لەدایکبووی شاری هەڵەبجەی شەهیدە.

بەکالۆریۆس: ڕێنمایی دەروونی.

ماستەر: ڕێنمایی دەروونی پەروەردەیی.

پرۆفیسۆرە لە زانکۆی سەڵاحەدین.

سەرۆکی بەشی دەروونزانی زانکۆی کۆیە بووە.

ڕاگری کۆلێژی پەروەردە / زانکۆی کۆیە بووە.

### بەرهەمەکانی :

المشكلات الإرشادية - أسبابها - وطرق علاجها.

التدخين.

فەرهەنگی توبا- کوردی- عەرەبی- ئینگلیزی بۆ زانستی دەرونی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی.

بەناو چۆنیەتی بەجێ هێنانی وانەوتنەوە بە کوردی و عەرەبی (نامیلکە).

سەرنووسەری گۆڤاری (الإرشاد النفسي) بووە.

سەرنووسەری گۆڤاری کۆلێژی پەروەردە/ زانکۆی موستەنسەریە بووە.

خاوەنی زیاتر لە (٥٠) توێژینەوەی دەروونی و پەروەردەییە لەسەر منداڵ و قوتابیان و ژنان، هەموویان لە گۆڤارە زانستییەکان بڵاوکراوەتەوە.

خاوەنی زیاتر لە (٤٠) نامەی بابەتی دەروونیە، کە لە ڕۆژنامەکان بڵاوکراوەتەوە.



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com




6000 دینار

Tafseer Office
Mobile : +964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com